# نامەی بەختیار

کۆمەڵە بابەتێکی گرنگ و نایابە
بۆ هەموو ئەو کەسانەی بە دوای ڕاستیدا ئەگەڕێن

دانراوی

ماmۆستا عەبدولکەریمی مودەڕڕیس



سرشناسه: مدرس، عبدالکریم، ۱۲۸۳ - ۱۳۸۴.
عنوان و نام پدیدآور: نامەی بەختیار: هونراوەیە کی ئایینی/ دانراوی عبدالکریم‌محمد المدرس.
مشخصات نشر: سنندج: امام ربانی، ۱۳۹۱.
مشخصات ظاهری: ۲۴۰ص.
شابک: ۹۷۸-۶۰۰-۹۲۰۹۱-۸-۷ :
وضعیت فهرست نویسی: فیپا
یادداشت: کردی.
موضوع: شعر کردی -- قرن ۱۴
رده بندی کنگره: ۳۲۵۶PIR /س۷۴۲م۳۶ ۱۳۹۱
رده بندی دیویی: ۲۱/۹فا۸
شماره کتابشناسی ملی: ۲۸۵۰۸۳۳


بێگومان ئەم پەرتۆکە شایاوی ئەوەیە کە مامۆستایان و زانایان لە زانکۆ و فێرگەکاندا بە وانە بیلێنەوە

# نامەی بەختیار

کۆمەڵە باسێکی گرنگ و نایابە بۆ هەموو ئەو کەسانەی بە
دووی ڕاستیدا ئەگەڕێن

دانراوی:
ماموستا مەلا عەبدولکەریمی مودەڕڕیس



انتشارات امام ربانی
مریوان




**انتشارات امام ربانی**

# نامەی بەختیار

| | |
|---|---|
| ✓ ناوی کتێب (نام کتاب): | نامەی بەختیار |
| ✓ نووسەر (مؤلف): | مەلا عەبدولکەریمی مودەڕڕیس |
| ✓ کەرەتی چاپ (نوبت چاپ): | یەکەم (اول)؛ ۱۳۹۲ |
| ✓ ژمارەی چاپکراو (تیراژ): | ۲۰۰۰ (بەرگ) جلد |
| ✓ ژمارەی لاپەڕەو قەوارە (تعداد صفحه و قطع): | ۲٤۰ صفحەی رقعی |
| ✓ بڵاوکەرەوە (ناشر): | انتشارات امام ربانی |

نرخی: ۷۰۰۰ تمەنە

شابک: ۷ ـ ۸ ـ ۹۲۰۹۱ ـ ۶۰۰ ـ ۹۷۸

ISBN: 978 - 600 - 92091 - 8 - 7

# ناواخن

# پێشەکی

بیرو باوەری ئیسلامی دەورێکی ئەساسی و بنەڕەتـی ئـەبینێ لـە ژیـان و کەسایەتی هەرمرۆڤێکی موسوڵماندا وە هەر هەموو لق و پۆپ و بەرهەمەکانی دینی پیرۆزی ئیسلام لەسەر ئیمان و عەقیدەیەکی ساغ و ڕاساڵ بنیاد دەنرێ و گەشە ئەکات؛ لای هەموان ڕوون و ئاشکرایە تا بناغـە و بنـەمـا بـەهێـزتر و تۆکمەتر بێت ئەوەی لەسەری بنیاد دەنرێت سەقامگیرتر و بەرهەمدارتر دەبێت؛ کەواتە مرۆڤی ئیماندار هەتا بیر و باوەڕی قووڵتر و بەهێزتر بێت بـەرهـەمـی باوەڕەکەشی کە موسوڵمانەتی و ئاکار و ڕەفتاری بەرزو پەسـەنـدە فراوانتـر و بەربڵاوتر دەبێت. پێچەوانەکەشی بە میزانی بێهێزی و لەرزۆکـی بیروبـاوەڕی هەرکەس ئاکار و ڕەفتاریشی لاوازتر و بێکەڵکتر دەبێت.

کەوابوو پێویسـتی سـەرشـانی هـەرمرۆڤێـکی بـڕواداره بـەتایبـەت لـەم هەلومەرجە هەستیار و ناسکەدا کە ئوم..ەتی ئیسـلام پێـیدا تێـپەڕدەکـات بـە هەرجۆر بۆی ئەکرێ لە پێەوکردن و لێتێـگەیشـتنی بنـەماکـانی بیروبـاوەڕی ئیسلامی و خووڕەوشتی بەرز و جوان کەمتەرخەمـی نـەکـات؛ دیـارە بـەبـێ زانیاری و بەرچاوڕوونی هیچ کە ناتوانیت وەکوو پێویسـت لـە ڕێـبازی دینـا حەرەکەت بکەیت و بەختەوەریی و سەرفرازی دونیا و دوارۆژ بە دەس بێنیت بەڵکوو زۆرجار درۆزن و چەواشەکەر هـەر ڕۆژ لـە بـەرگ و لیباسێـکدا لـە ڕاستە شەقامی بیروباوەڕەکەت دەتترازێنن و بەرەو هەڵدێرت ئـەبـەن و ملـت

ئەشکێنن. هەر بۆیە خوای باڵادەست ئەمرمان پێ‌ئەکات و ئەفەرموێ »وَلَا تَقْفُ مَا لَيْسَ لَكَ بِهِ عِلْمٌ«[1].

جا خوێنەری هێژا ئەم کتێبەی بەردەستت کە نووسراوێکی دیکەیە لە نووسراوە بەهێز و پێزەکانی زانا و هەڵکەوتوو و پێشەوای زەمان، مامۆستا عەبدولکەریمی مودەڕیس؛ هەوڵێکە لە بواری بەهێز کردنی بناغە و بنەماکانی ئاییندا. باس و بابەتەکانی ئەم کتێبە کە لە شێوازی پرسیار و وەڵامدایە لە دەوری ئیمان و عەقیدە بە هەموو لق و پۆپەکانیەوە و نیازی مرۆڤ بە ئایین و هەروەها فەلسەفەی «تشریع»ی حوکمەکانی شەریعەت و... سووڕ دەخۆن. بەڵام بەو پێو دانگ داڕشتنەی کە زانایانی عیلمی کەلامی لەسەر بوون؛ کە دەکرێت بڵێین: ئەم کتێبەی مامۆستا پوختەیەکە لە زانستی کەلام. بە واتایەکی‌تر ئەتوانین بڵێین: لایەنی سەرەبەهێزی ئەم کتێبە ئەوەیە ئەو باس و بابەتە سەخت و ئاڵۆزانەی کە تەنها لە کتێبە مەزن و گرانەکانی عیلمی کەلامدا توێژینەوە و لێکۆڵینەوەیان لەسەر کراوە، وە بۆ تێگەیشتن لێیان نیاز بە شارەزاییەکی هەمەلایەن و تیر و تەسەل لە زانستی «حکمت، کلام، منطق و اصول» هەبوو مامۆستای خەمخۆر و مشوورخۆری گەلەکەی بە کورتی و پوختی وە لە ژێر تیشکی تێگەیشتنی پێشینە چاکەکاندا (السلف الصالح) بە داڕشتنێکی ئاسان و ساکار لەسەر زمانی زۆرینەی خەڵکی ئاراستەی دەکات؛

---

[1] - الاسراء /٣٦/واتە: مەکەوەرە شوێنی شتێ کە زانست و فامت پێی نەگەیشتوە.

کە بەڕاستی بە کوردی کردن وە زمانی کوردی بە عیلمی کـردن «کـە لـە زۆر بواردا ئەوکارەی کردووە» لە بابەتێکی وا قورس و گراندا کاری هـەمووکـەس نییە، مەگەر پسپۆڕێکی وەکوو مامۆستا کە خۆی قاڵبووی ئەومەیدانـە پـڕ لـە سەختی و ئاڵۆزەیە. وە ئەوپەڕی دەسەڵاتی ئەو زانا مەزنـە لـەو بوارانـەشـدا پیشان ئەدات. دڵنیام کە ئەم کتێبە بۆ هەموو چـین و توێـژێ گـەوهـەرێـکی بێهاوتایە؛ یەکەم: بۆ ئەوانەی ئەیانـەوێ بـە بـەڵـگەی بـەهێـزەوە کۆسـپ و تەگەرەکانی سەر ڕێی ژیانی پڕ لە هەوراز و نشێو تەخت و ناچۆخ بکـەن، وە تەم و مژی کوفر و بێباوەڕی لەسەر لوتکەی چیای ئیمان بـڕەوێـننو. دووەم خوایار بێ دەبێتە ڕێگەپیشاندەر بۆ هەموو ئەو کەسانەی کە لەبەر ناشارەزاییان لە ڕاستیەکانی شەریعەتی بێ هەڵە و پەیڕەوی خوا بـە قـوڕ و لیتـە و زەلکـاوی بیری کرچ و کاڵ و پڕ لە قسە و قسەلۆکی بەتاڵ فیترەتی خۆیان داپۆشـیوە و لە گێژاوی دوودڵی و سەرگەردانیدا سوڕ دەخۆن و وەکوو پـووش و کـەفـی سەر دەریا، با ڕەشی بێباوەری و «الحاد» هەر سات بەرەو لایێ گێـژیان دەدا و ڕاپێچیان ئەکات. بەڵام بەو مەرجەی بە چاکی فام بکرێ و بخوێنرێتەوە . با من لەمە زیاتر سە رتان نەیەشێنم دەڵێـن: پێشـینانیش گوتوویانـە: هیچکـات بیستن نابێتە دیتن ئەوە ئێوەی بەرێز و ئەوەش کتێبەکـە بیخوێـنـەرەوە تـا ئـەو زانستیەت بۆ دەرکەوێ.

## لێرەدا ئاماژە بە چەند شت پێویستە

**یەکەم**: ئەم کتێبەش وەک «شەوچەرەی دڵدار» یەکەمجارە ئامادەی چاپ دەکرێت و بڵاو دەبێتەوە. بە هەوڵ و کۆششی بەڕێز مامۆستا مەلا یۆنسی وەیسی دزاوەری، نووسراوەکەی مامۆستا ساغ کراوەتەوە و نووسراوەتەوە؛ بەندەش لەگەڵ ئەو بەڕێزانەدا لە ئەووەڵەوە تا کۆتایی لەگەڵ دەسنووسەکەی مامۆستادا بەراورد و هەڵەگیریمان کردووە.

**دووەم**: وشە عەرەبییەکانمان لەسەر شێوەی ڕێنووسی عەرەبی نووسیوە و لەبەین دوو کەوانەدا دامانناوە؛ مەگەر لەو وشە و ڕستانەدا کە کورد زۆر بەکاریان ئەهێنێ و ڕەنگی کوردییان بەخۆوە گرتووە؛ ئەوە ئیتر مامەڵەی وشەی کوردییان لەگەڵدا کراوە و لەسەر ڕێنووسی کوردی نووسراون.

**سێیەم**: بەپێی بواری گونجاو لە هەر شوێنێ پێویست بە ڕاست کردنەوە یان گۆڕانکارییەک بووبێت ڕاستمان کردووەتەوە و گۆڕیومانە؛ وە ئەگەر لە جێگەیەکدا ئایەتێک یا فەرموودەیەک وە یا وشە و ڕستەیەکی عەرەبی یا کوردی نیازی بە ڕوونکردنەوە بووبێت لە پەراوێزدا ڕوونمان کردووەتەوە و مانامان بۆلێکداوەتەوە.

## پوختەیەک لە ژیانی مامۆستا :

هەرچەند شوێنی لەدایکبوونی مامۆستا زۆر ڕوون نییە بەڵام بە گوێرەی نووسراوەکانی خۆی، مامۆستا لە ئاوایی «تەکیە»ی ناوچەی «سەید سادق»ی

ناوچەی شارەزوور چاوی بە دونیا هەڵێناوە. هەرچەند کۆمەڵێک دەڵێن هەندێ بەڵگە وا نیشان نەدەن کە مامۆستا لە ئاوایی «گوێزەکوێرە»ی نزیکی شاری مەریوان لە دایکبووبێ.

مامۆستا ناوی عەبدولکەریمە و کوڕی محەممەدی کوڕی فەتتاحی کوڕی سلێمانی کوڕی موستەفای کوڕی محەممەدە و لە بنەماڵەی ناوداری قازییە، کە وەک پێشتر ئاماژەمان پێدا لە ناوچەی سەیدسادقی ناوچەی شارەزوور دانیشتوون، مامۆستا لە ساڵی هەزارونۆسەدوسێی (١٩٠٣ز) هاتووەتە دونیاوە و لە کۆشی خێزانێکی ئایینیدا گەورە بوە، وە لە تەمەنی چوار- پێنج ساڵیدا وەبەر خوێندن نراوە، لە ساڵی ١٩٠٧ کە تەمەنی چوار ساڵ بووە، باوکی کۆچی دوایی کردووە و لەسەر وەسیەتی باوکی و لە ژێر چاودێری دایکیدا درێژە بە خوێندن دەدات و لەلای گەورە زانایانی ئەو سەردەمەی ناوچەکانی کوردستانی ئێران و عێراق زۆرێک لە زانستەکانی خوێندووە و بۆ دوا قۆناغەکانی خوێندنی ئەچێتە سلێمانی و لە خانەقای مەولاناخالیددا بە خزمەت بەناو بانگترین زانای ئەو سەردەمە (مامۆستا شێخ عومەر ئیبنولقەرەداغی) ئەگات و دوایین پلەکانی زانستی عەقلّی و نەقلّی ئەخوێنێ و بڕوانامەی مەلایەتی و وانەبێژی لەلای ئەو مەزنە زانایە وەرئەگرێت. پاش ئیجازە وەرگرتن ئەچێتە ئاوایی «نێرگسەجار» و بۆماوەی چوار ساڵ لەوێ ئەمێنێتەوە. پاش ئەوە لە ساڵی ١٩٢٨ز لەسەر داوای گەورە پیاو و موڕشیدی

ئەوسەردەمەی کوردستان حەزرەتی شێخ عەلائەددین بــە پێشــوازییەکــی زۆر گەرمەوە لە تەمەنی ٢٥ ساڵیدا ئەچێتە بیارە و ئەبێتە وانەبێژی ئەو مەدرەسەیە کە ناوەندێکی بەهێزو پێزی نایینی و عیرفانی، وە گەورەترین زانکۆو فێرگەی ئەو سەردەمەی کوردستان بــووە؛ مامۆســتا لــە بیــارەدا بــۆ مــاوەی ٢٣ ســاڵ دەمێنێتەوە و پۆل‌پۆل فەقێ لە کورد و نەتــەوەکــانی دیکــە وەکــوو عــەرەب و فارس و تورک دەهاتنە خزمەتی و بەهرەی بەرزی زانستییان لێ وەردەگرت و لەسەر دەستی مامۆستادا بڕوانامەی مەلایەتییان پێ خەڵات ئــەکــرا. مامۆســتا سەرەڕای وانەبێژی، چەندەها فــەتــوای فیقهــی ورد و چــەنــدین پــەراویــز و تەعلیقات و لێکۆڵینەوەی لەسەر ئەو کتێبە گرنگانە نووســیوە کــە ئــەو کــات خوێندنیان لە حوجرەکانی کوردستان و جیهانی ئیسلامدا باو بووە. پاشــان لــە ١٩٥١زدا ماڵئاوایی لە بیارەیش دەکات و بــەرەو سلێــمانی کــۆچ ئــەکــا، لــە مزگەوتی «حاجی حان» بە ناوی مودەڕڕیسەوە دائەمەزرێت. لەپــاش ئــەوەی کە هەندێ کێشە و ناکۆکی بۆ دروست ئەبێت دڵــی دەڕەنجێــت و سلێــمانیش بەجێ‌دێڵێ و دەچێتە تەکیەی تاڵەبانی لە کەرکووک. لەوێیش بۆ ماوەی شەش ساڵ سەرقاڵی نووسین و وانە وتنەوە بووە (زیاتر بە مامۆستایانی کەرکــووک). لە ساڵی ١٩٦٠زدا دەچێتە بەغدا و یەکەمجار لە مزگەوتی «ئەحمەدی» بەناوی پێشنوێژ و خەتیبەوە دائەمەزرێت. لە ساڵی ١٩٦٤ز دا دەچێتە بارەگــای شێــخ عەبدولقادری گەیلانی و دەبێتە وانەبێژ و پێشنوێژی ئەو بارەگایە؛ لــەوبــارەگــا

بەرز و پیرۆزەدا بۆ ماوەی ٤٠ ساڵ ئەو گەورە زانایەی کورد کە دەریایە بوو لە زانست، کۆڕی دەرس و فەتوای لە ئاسمانی هەر هەموو وڵاتانی ئیسلامیەوە دەنگی دەدایەوە و سنوورەکانی تێپەڕ کرد و پۆل‌پۆل زانستخوازان لە هەموو وڵاتانەوە دەهاتنە خزمەتی و بە پلەی بەرزی زانستی دەگەیشتن و بە کۆڵی عیلمەوە دەگەڕانەوە زێدو مەڵبەندی خۆیان.

مامۆستا بە درێژایی تەمەنی پڕخێر و بەرەکەتی سەرەڕای تەدریسی ئەو کتێبە سەخت و گرانانە (تفسیر، فقه، اصول، کلام، حکمت، و ...) بە دەوام خەریکی نووسین و کتێب دانان بوو. لە ساڵی ١٩٧٤ز کراوەتە سەرۆکی ڕابیتەی عولەمای عێراق و دواتر بووەتە موفتی هەر هەموو عێراق. وە لە ساڵی ١٩٧٨ز تا کۆچی دوایی کردووە ئەندامی کۆڕی زانیاریِ عێراقیش بووە. ئەم زانا پایە بەرز و ماندوو نەناسە دوای تێپەڕ بوونی زیاتر لە ١٠٣ ساڵ تەمەنی پڕ خێر و بەرەکەتی، وە ئیجازەدان بە سەدان زانا لە کورد و غەیری کورد، وە نووسینی زیاتر لە سەد کتێب بە هەر سێ زبانی عەرەبی و کوردی و فارسی لە ڕێکەوتی ٢٩/ ٢٠٠٥/٨ی زایینی ڕۆحی بەرزی بە لیقای پەروەردگار شاد بوو.

فسلام علی «نامی» یوم ولد و سلام علیه یوم مات و سلام علیه یوم یبعث حیا

**جەمیل ئاشنا**

**بەفرانباری ساڵی ١٣٩١ش**

**مەریوان: مزگەتی حەزرەتی عەلی**

# سەنا و ستایشی خودای پەروەردگار

بـــەناوی خـــودا لێو ئـــەکـەمەوە
بە وێنەی غـونچەی گـوڵ بـەدەمەوە[1]
خودای بەخشەندە، خودای میهرەبان
بـــۆ هــەموو عــالەم ئــەوە نــیگابان
هــەر بـۆ ئــەو ئـەشێ بـەبێ ئالایش
بــە هــەموو جۆری سـەنا و سـتایش
هەر ئەوە بـە حـەق «واجب الوجـود»
هەر بە ئـەو نـابوود ئـێتە ڕێزی بـوود
هـەر ئـەوە خـاوەن کـەماڵی یـەکسـان
هەر ئەوە دوورە لە عـەیب و نـوقسان
هـەر ئـەوە تـەنیای بـێوێنـە و مـانەند
ئـــەوە هـــەر بـــووە، ئـەوە خـوداوەنـد
هـەر ئـەو ئـەمێنـێ، ئـەوە دەوڵەمـەند
بــێنــیاز لە کــەس، نـاکـەوێتـە بـەند
هـــەر ئـەو زیـندووە و هـەرگیز نـامرێ
هـــەر زانســـتی ئـەو عـالەم دائـەگرێ

١. (نسخە):
بەناوی خودا ئەشنێمەوە بە وێنەی غونچەی گوڵ بەدەمەوە

هەر ئەوە خاوەن خواست و خواهیشە
بە هێزی موتڵەق پڕ نومایشە
هەر ئەوە بینا و شنەوای ئاواز
هەر ئەوە زانا لەسەر وردە ڕاز
هەر ئەوە خاوەن کەلام و گوفتار
لەبۆ یەکسەد و بیست و چوار هەزار
هەر ئەوە گەورە و بچووك ئەبینێ
لە فەرمان دانا قەد دانامێنێ
هەر ئەوە بە حەق پەنای بۆ ئەبرێ
فەرمانی ئەوە عالەم دائەگرێ

❊ ❊ ❊

**«لٰا حَــوْلَ وَ لٰا قُــوَّةَ إِلّٰا...**
**بِـاللّٰهِ الْـحَقِّ الْـعَلِيِّ الْأَعْـلىٰ»**
چۆن بەبێ شەرمی جەسارەتم کرد
چۆن من زمانم بۆ سەنای ئەو برد
کێ بێ تێبگا لە باسی زاتی
لە بەرزی پایە و مایە و سیفاتی
زاتێ بێ میسال، بێ چەند و چوون بێ
لە بیری ئەوا زانا نگوون بێ
زاتێ پەنهان بێ لە «عالم الْغیب»
هۆش بێهۆش ئەبێ لەو زاتا «لا ڕیب»

شـــاسواری عـەرش و مـافەوقی فـەلەك
پـێشـــەوای جینن و ئـینسان و مـەلەك
فـــەرمووی بـــەرابـــەر بـــەباسی «إدراك»
«سُـــبْحَانَكَ سُـــبْحَانَ وَ مَـــا عَـــرَفْنَاكَ»
ئـــیترکـــێ بـــێ بـــۆی عـــەقلّی لێ بـێ
دەم بـــدا لە بـاس، مـەگـەر بـەبێ جێ!
لە مـــەجوودێ وا دوور لە خـــەیاڵ بـێ
مـــەعبوودێکـــی وا خـاوەن کـەماڵ بـێ

❊ ❊ ❊

هەرگا شابازی بـورجـی مـەعریفەت
بگا بـە ئـەوجی عـیلمی حـەقیقەت
ئـــەوجا ئـــەزانـــێ بـــێ پـــەڕ و بـــاڵە
فـڕین بـۆ بـەرزی قـودسی مـەحاڵە
بـــۆیـە ئـەوانـە بـە حـەق زانـا بـوون
لە حاڵی خـۆیـان بـاش ئاشنا بـوون
وایـــان بـــڕیـــار دا زانســـتی ئینسان
ئـیقرارکـردنە بـە جـەهل و نـوقسان
راستی ئەمەیە تـۆ بـوودێکـی[1] وای
خـــارج لە هـێزی دەرکـی مـاسیوای
ئەمەندە هەیە کـە مـەوجوودێ وای
بویـت و هەر ئەبیت، بەری لە فەنای

---

1. واتە: مەوجوودێکی وای.

زات و سیفات و کردەوەت پاکە
هەرچی تۆ ئەیکەی حیکمەتە و چاکە
کەس ئاگای نییە لە سیڕڕی کارت
مەر ئاگادار کەی گرۆی ئەخیارت
ئەوان بەو عیلمە تۆ بەشیان ئەدەی
لە بازێ ئەسرار ئاگایان ئەکەی
جیهان سەراسەر هەمووی نابوود بو[1] و
لە شان و شێوە بەشێکی نەبوو
خواستت دەرکەوێ وجوودی زاتت
جیلوەگەر بێ شان و سیفاتت
هێناتە وجوود ڕشتەی مەوجوودات
لە سارا و دەریا و سیمای سەماوات
دار و کۆسار و سەروی جۆباران
خەیمەی گوڵاڵەی کاتی بەهاران
بێ گیان و گیاندار، پەرەندەی باڵدار
چەرەندەی دەربار، دوڕەندەی کۆسار
لەعل و مەرجان و گەوهەر لە دەریا
چەرخی ئاسمان درا بە سەریا
شەو بە مانگەشەو، ڕۆژ بە هۆی هەتاو
بۆ گیانلەبەران ژینت هێنا ناو
بە ئەستێرەکان گەردوون ڕەنگین بوو
بەهۆی ژیرەکان جیهان شیرین بوو

١. واتە:وجودی نەبوو.

هەموو پڕتەوی خواستی خودایە
که خواستت نەبوو ئەڕوا بە زایە
بە خواستت گەدا ئەبێ بە شاهێ
بێ خواستت شاهێ ئەبێ بە کاهێ
هەرتۆی بەڕاستی فەرمانڕەوای حەق
هەرتۆی بۆسوجدەی«ساجِد»موستەحەق
هەرچۆن مەیلت بوو ئەبێ هەر وابێ
بەبێ خواستی تۆ هیچ شتێ نابێ
بێ تۆ نەسیمی نایێ بەربەیان
نەشئەیی ناگا بە دڵ و بە گیان
بەبێ فەیزی تۆ نابێ ئینسانێ
بگا بە بارەی خێر و ئیحسانێ
بێ تۆ دەروونێ ناکا خەیاڵێ
بۆ کەس دەس نادا زەوق و ئەحواڵێ
بێ تۆ حەل نابێ گرێ لە کارێ
بە مەنزڵ ناگا هیچ دەردەدارێ
دەرد لە تۆیە و بە تۆیە دەرمان
بە تۆیە جەفا و «صُداع»[1]ی سەرمان
هەر تۆ ئەزانی مەبەس ڕێ بخەی
لەسەر ڕێی مەبەس یارمەتی بدەی
ئەگەرچی عالەم لەسەر ئەسبابە
لەگەڵ خواستی تۆ سەبەب حیسابە

١. صداع: سەرئێشە، ژانەسەر.

هەوێنی خواستت نەبێ لەو ناوە
شیر نەگرساوە و دۆ پڕوزقاوە
لەسەر ئەسبابە ئەبمە فیلەسووف
دونیام لێ ئەبێ بە ماددەی مەکشووف
بە سەبەبسازیت ئەنوم لە شەودا
بە سەبەبسۆزیت ئەکەومە سەودا
**«فَاهْدِني رَبِّي لِخَيْرِ الْأَسْبابِ**
**إِنَّكَ أَنْتَ الْعَلِيمُ الْوَهَّابِ»**[1]
بەسە بۆ عاقڵ لە سەنای زاتت
لە ستایشی شانی سیفاتت
ناردت ئەنبیای ڕەهنومای کیرام
بۆ شارەزایی هۆش و عەقڵ و فام
ئەنجامت هێنا بە دووڕی شاوار
یانێ «محمّد» **«سیّد الأبْرار»**



١. کەوابوو تۆ شارەزام کە بۆ باشترین هۆکارەکان بەراستی هەرتۆیت زۆر زاناو بەخشندە.

## وەسف و سەنای حەزرەتﷺ

ئـــەو مـــوحەممەدە کـــانی خـێراتــە
مـــایەی پـیرۆزی ڕووی ســەر بـیساتە

ئـەو مـوحەممەدە بـەو حـەمدی خـوا
لەســـەر زمـــانی عـــالەم بـوو پـەیدا

ئـەو موحەممەدە بوو بەهۆی تـەوحید
بوو بەهۆی تەقدیس بۆ خـودای مـەجید

ناو و خاوەن نـاو بـەرزی و شـەرەف بـوو
ئیشارەی پەنجەی هەر شەش تەرەف بوو

دوڕڕی بێوێنـەی سینەی سـەدەف بـوو
خۆلاسەی سەفای هـەموو سـەلەف بـوو

کـورەی کـائینات بـەو مـونەووەر بـوو
مەعنای سەعادەت بەو موسەووەر بوو

بـەو بـوو دامـەزرا ئـاڵای هـیدایـەت
بـەو سـەقامگیر بوو عـەدڵ و عـینایەت

بـــەو عـیلم و زانست گـەیشتە کـەیوان
دامـــەزرا لەســـەر مـەعریفەت سـەیوان

❊ ❊ ❊

زات و سیفەتی چاك ڕێ کەوتبوو
لە ڕووی جیهانا تاك هەڵکەوتبوو
تۆمی نەتەوەی چاك و پاکان بوو
لە پشت و ڕشتەی دڵ ڕووناکان بوو
بوو بە چرای عەرز لەگەڵ ئاسمان
بە ڕێك‌وپێکی هاتە ڕووی جیهان
ئەونە وجوودی نوورێکی پاك بوو
سێبەرەکەیشی لەوۆ ڕووناك بوو



بەر لە بوونی ئەو با باوکی بمرێ
تا لە خوداوە تەمێ وەربگرێ
خودا بۆ سەواب خاوەن هۆشی کرد
بۆیە «ثویبە» یەکەم گۆشی کرد
مادام بۆ عالەم پەنای «مَأْمَن» بێ
با بێشکەی کۆشی «أُمُّ أیمَن» بێ
کە مودارا و حیلم هۆی تەئسیری بێ
ئەبێ «حَلیمە» دایەی شیری بێ
جیا بوو لە عالەم، مەگەر هەر لەوا
هەموو مەخلووقن بۆ زاتی خوا
جیای کردەوە لە گشت هاوسەران
تا نەڕواتە سەر خولقی دیگەران
بوو بە هاوڕازی «جبریل»ی ئەمین
بوو بە جێی نازی **«ربّ الْعالَمین»**

لە دەرز و دەوری ئادەم مەحفووز بوو
مامۆسای دەرزی «لوح الْمَحفوظ» بوو
هەتا پێی نەگاگەردی مەدرەسە
داوێنەی نەگرێ تۆزی وەسوەسە
یەکێ هەر نوور بێ سیایی[1] کامە
تا نوختە دانێ لەسەر ڕووی نامە
یەکێ وەکوو ئەو پاك و بێغەش بێ
چۆن ڕووی لاپەڕە لەوەوە ڕەش بێ
مادام ڕەحمەت بێ لەبۆ عالەمین
مادام چرا بێ بۆ سەما و زەمین
ئەبێ نوختەی ڕەش لە عالەم لادا
چۆن ئەبێ دەستی بۆ ڕەشی بادا

❊ ❊ ❊

کەسێ کە دەرزی عالەم دابدا
ئەبێ خودا خۆی دەرزی پێ بدا
ئەبێ وەربگرێ قورئانێکی وا
لە بۆ خۆرهەڵات هەتا خۆرئاوا
بە نەزمی یاسا و بەبەرزی هیممەت
ئەبێ بەسوود بێ بۆ هەموو ئوممەت
بۆ بیر و باوەڕ بە پەروەردگار
بۆ ڕۆژی جەزا لەسەر تۆڵەی کار

١. سیایی: ڕەشایی، تاریکی.

بۆ ئاسایش و دادی ڕووی جیهان
یەکسان بۆ گەدا و بۆ زومرەی شاهان
ئەمەیە ڕەحمەت بۆ گشت گیانلەبەر
جا بە دڵ بڵێ «ألله أكبر»
کاکە شەهادەی عالەمی وایە
مایەی ڕەحمەتی هەردوو دونیایە

* * *

چییە موعجیزە و قسەی دار و بەرد
موعجیزە سەبرە لە جەفای نامەرد
ئەو کە بوو بە ڕۆژ لە ڕووی زەمانا
مانگ بۆ لەت نەبێ لە ئاسمانا
حەقیە بناڵێ کۆڵەکەی مزگەوت
کە ئەو بەجێی هێشت، لە مینبەر سەرکەوت

* * *

شەوڕەوی پێکرد پادشای ئەقدەس
لە مەککەوە تا «بیت المقدّس»
تابێتە هاوڕێی سەفای جوبرەئیل
ببینێ قیبلە و بارەگای خەلیل
سەرکەوت لە زەوی و بەرزی ئاسمان
لەبۆ پیرۆزی مەکان و زەمان
ساڵەها فەلەك بە شینی داکەوت
تالیعی یار بوو، هەتاوی لێکەوت

شەو زۆر موشتاق بوو بە هەتاوی ئەو
دەی بــا بـرێژێ بـەسەریا پـرتـەو
زوو بـەوێنـەی بـەرق هـاتەوە زەوی
عالەمی تەی کـرد لە بـەرزی و نـەوی
تا بـۆی دەرکـەوێ لەم ڕووی دونـیایە
هـەر خـودای جیهان فـەرمانڕەوایـە

❊ ❊ ❊

## باسی ئال و یارانی پێغەمبەرﷺ

بــۆ نــوور وەرگــرتن لە سـیمای پـاکـی
فـێری ئـەدەب بـوون لە خـولقی چـاکـی
کــۆمـەڵێکـی نـارد گـەوهەر تـەبیعەت
ئــامادە لەســەر ڕێگــەی حــەقیقەت
مــەبەس لە ئــال و یــارانــی ڕاسـی
فــیداکــارانــی ڕێگــەی حـەقناسی
گشت خــاوەن هـۆش و عـیرفان و تـەدبیر
گشت پــڕ لە هــێزی تـەنویر و تـەئسیر
فـریشتە مـەشرەب بـۆ پـاکـی ئـەخلاق
خــاوەن ئــەدەب و ئــیدارەی ئــافاق
شــــابازەکــانی نشــینگەی ئــایین
ســـەرفرازانـــی تـــەختگای تـــەمکین

ئـەستێرەی بـورجـی عـەقڵ و مـەعریفەت
سەرمەشقی دەرزی سەربەرزی و عـیززەت
دوور لە هـەوای نـەفس، لە ڕەزیـلە پـاك
وێنـــەی فـــریشتەی دائـیرەی ئـەفلاك
لە نـــووری پـــاكـی سـیمای مـوستەفا
وەریـــان گـــرتبوو شـــەوچرای ســـەفا
شـێری بـێشـە بـوون بۆ ڕۆژی مـەساف
شێری هـیندی بـوون بۆ ئـەهلی خـیلاف
بە نـەرمی وێنـەی شـیری بـێ کـەف بـوون
بە گەرمی هـەموو شـمشێر بـە کـەف بـوون
چـی بـڵێم لە وەسـف و سـەنای ئـەمانە
ئـــایەتی قـــورئان لە شـــەئن یانە
بـــەسە بـۆ سـەنا و بـۆ مـەدحی ئـەوان
ڕەزایـــان لە خـــودا، ڕەزای ئـــەو لەوان
ڕەزای حـــــەق لەوان عـــافیەتیانە
ڕەزایـــــان لە خـــــودا عـــاقیبەتیانە
**«رَضِـــــيَ اللهُ عَـــنْهُمْ أَجْـــمَعِين**
**وَ عَـــنَّا بِـــهِمْ، مَـــعَ التَّـــابِعِينَ»**

❊ ❊ ❊

دەیســا بـا بـڕژێ لە هـەوری ئـیحسان
ڕەحـمەت بـەوێنـەی بـارانـی «نـیسان»

سـەلات و سـەلام ئـەزەل تـا ئـەبەد
بۆسەر قوبەی پاك «روضه»ی موحەممەد
لەپـاش ئـاودانـی باغچەی ئەحمەدی
بە نـەشەی شـەوبای سـەفای سـەرمەدی
وێنـەی نـەسیمی سـەحەری بـەهار
لەسەر سەوزەی ڕووی داوێنـەی کۆسـار
سـەروازکـا و بـڕژێ سـەلات و سـەلام
بـۆ گـیانی ئـال و یـارانـی کـیرام
بـەهۆی عـەلاقەی بـەندی ئـیتتیباع
بـێتە سـەر سـەوزەی کۆمـەڵەی ئـەتباع
بـەڵکـوو چـەن نـمێ بگـەیێ پـێمان
پـەلوپۆی ئـیمان بـڕوێنـێ لێمـان
شـایەد لە وادەی نـیدای مـونادی
لە ژێر ئـاڵاکـەی حـەزرەتی هـادی
مەحشوور بین لەگەڵ ڕەسوولی ئەمین
بگـەین بـە ڕەزای «ربّ العـالمین»

❊ ❊ ❊

# هۆی دانانی ئەم کتێبە

پاش ئـەمە ئـەڵێم: هـۆی ئـەم تـەئلیفە
بـۆ ئـەو یـارانـە خـوویان شـەریفە
دڵم نـەخۆش بـوو بـە گـەلێ ئیشکال
بـۆ دڵم بـووبوون بـە مـایەی مـەلال
ڕۆژ لە ڕۆژ بـەتر چـاوم تـاریك بـوو
ڕێگـەی هـاتوچۆی دڵم باریك بـوو
جـا کـەوتە گـەردش بـە دوای دەرمـانا
لەسـەر زەمـین و لە ئـاسمانا
بەڵکوو پـزیشکێ دانـای دەسکـەوێ
لە دەرمـان کـردن پـەکی نـەکـەوێ
بـیکا بـە یـار و بـە ئـاشنای گـیان
هـۆی ڕزگـاریم بـێ بـۆ مـاوەی ژیـان
«نـامەی بـەختیار» بـداتـە دەسـتم
تـا بـەختەوەر بـم لەسـەر مـەبەستم
ئەگەر ئەپرسی دەردی دڵ چی بوو؟!
بۆچی ئەم دڵەم شێت و شەقی بوو؟!
ئـەکـەوتە خـەیاڵ: ئـەم دونـیا چییە؟
کـام حـاڵی هـەیە و لە چـی بـەرییە
لە خـۆوە بـووە، یـا خـۆ دەسکـارە؟
ئەگەر دەسکارە کام کـەس مـیعمارە؟!

سـانیعی کـێیـە و چـۆنـە سیفاتی؟
هێزی چۆن ئـەگـا بـە مـەخلووقاتی!؟

* * *

چـیـیە لە ژیـنا ئـاداب و ئـایین؟
کـێیـە ڕەهنوما بـۆ ڕێگـەی یـەقین؟
یـانێ بـزانـێ ڕەهـبەر کـام کـەسە
کـێیـە سـیفاتی وا مـوقەددەسە
بۆ کردەوەی کـار ئـەنجام چـۆن ئـەبێ
کێ سەربەرز ئەبێ و کێ نگوون ئەبێ
لەپـاش گـەردشیا تـالیعی یـار بـوو
فـائیزی دەوای دەرد و ئـازار بـوو
بەختی یاری کـرد گـەیشت بـە یـاری
دوکـتوری حـاڵزان شـیرین کـرداری
لە ڕوویـا ئـەنوار ئـەدرەوشایەوە
بـە وێنـەی گـوڵبـاغ ئـەگـەشایەوە
دڵ پاك و ڕووناك، سینە سادە و ساف
یـانێ بـەوێنـەی کـوردەکـانی جـاف
دڵبەر، دڵ ڕاکێش وێنـەی مـوغناتیس
دەم بـە شـەکـەری ڕازانـی نـەفیس
مـومیایە بـوو بـۆ دەسـتی شکـاو
تـوتیایە بـوو بـۆ چـاوی ئـێشـاو
وێنـەی نـەسیمی دەڕەی کـۆساران
ئـەشنا لەسـەر دڵی دڵداران

یا بێنی یەخەی یاری قەد عەرعەر
که سینەی پڕ بێ لە عەتر و عەنبەر
بە واتەی ڕووناك بە دوو دەقیقە
پەردەی لائەدا لە ڕووی حەقیقە
کە پێی گەیشتم دڵم ئارام بوو
چونکی واتەی ئەو «**مِسْكٌ خِتام**» بوو

❋ ❋ ❋

ڕووم کردە سیمای سافی نوورانی
وتم: ئەی پاشای گرۆی ڕۆحانی
چەن مەتڵەبێکی وردی پڕ ئیشکاڵ
دڵیان گرتووە بە وێنەی چنگاڵ
دەس بە داوێنت وەك عەرەب دەخیل
لەم گێژولێژا بۆم بە بە دەلیل
ئەبێ بۆ دەوای دەردم تێکۆشی
ڕزگارم بکەی لە هۆی نەخۆشی
ناسك بێ قسەت، چونکە مەلوولم
بە دڵ گیرۆدەی بای گێژەلوولم
قسەیێکم کرد لەلات نابار بێ
نەکا بۆ دڵت مایەی ئازار بێ
وەڵامت سادە و بەشێوەی کوردی
دوور بێ لە جەفای فەلسەفەی وردی

نـــامەوێ خـــاشاك بكـــەوێ لە ڕێم
ڕێگـــاییێكـــی پـــاك نـــیشان بـــدە پـــێم
تـــوولەی[1] ڕەهـــبەران فـــەیزی خـــودایـــە
چوون هۆی ڕزگارین لەم ڕووی دونیایە

❊ ❊ ❊

لێوی كـردەوە چـوون غـونچەی سـەحەر
نـــەشئەی ڕۆحئـەفزای لێ ئـەكـەوتە دەر
فـــەرمووی: چـــیت ئـەوێ؟ لەلام ئـاسانە
یـــارمەتی دامـــاو شـــەرتی ئـــینسانە
ئـــادەمی ئـــەبێ بـــە نـــەفس و بـــە مـــاڵ
بـــە پـــایە و مـــایە وەربگـــرێ كـــەماڵ
تـــێكـــۆشـــێ لەبـــۆ چـــارەی نـــەخۆشـی
بـــبێ بـــە مـــایەی بـــەرزی و دڵخـــۆشـی
بـــبێ بـــە چـــرا بـــۆ شـــەوی تـــاریك
بـــبێ بـــە دەسكـــێش لە ڕێگـــەی باریك
بـــەڵام لەبـــۆ تـــۆیش ئـــەی نووری دیـدە
شـــەرتێ پـــێویـــستە زۆر پـــەسەندیدە
ئـــەبێ «مَـــبْدَأ»ی یـــانێ ئـــەساسێ
لەنـــاوا دانـــێی وەكـــوو مـــیقیاسێ
شـــەخسی بـێ مـەبدەء ڕوشـدی مـەحاڵە
قســـە لەگـــەڵیـــا كـــاری بـــەتاڵە

---

١. واتە: كۆمەڵ، گرۆ.

مەبدەئمان چی بێ؟ شوعوور و حەواس
که دەست ئەکەون لەلای عام و خاس
یاخود دەلیلی ڕووناکی عەقڵی
یاخود خەبەری سەحیحی نەقڵی
که زەوقم تامی ئەم شەکرەی نۆشی
«سَمِعْنَا»م بۆکرد زوو بە دڵخۆشی

* * *

## باسی بوونی خوا

**پرسیاری یەکەم:**

مامۆستای زانا بە ئەسراری کار
خاوەن بەراورد، فامیدەی هۆشیار
ئەم کائیناتە کە تۆ ئەیبینی
چ ئاسمانی چ سەرزەمینی
مانیعی چییە واجب بێ بوونی
مەحاڵ بێ بۆ ئەو وەزعی نەبوونی
یاخود مومکین بێ بوون و نەبوونی
بشێ بۆ کزی و فەنا و زەبوونی
بەڵام بە «صُدْفە» یانێ بە ڕێکەوت
خۆی پەیدا بووبێ بە شێوەی هەڵکەوت
هەروا بمێنێ لەسەر ئیستیمرار
هیچ ئیجاب نەکا بە پەروەردگار

**وەڵام:**

شـــاگــردی وردی تــالیب بـۆ کـەماڵ
ئـــامادە لەبـــۆ تــەحقیقی ئــەحواڵ
سێ شت هەڵئەگرێ کورەی کـائینات
ئاسمان و عـەرز و بـاقی مـەجوودات
یا هەمووی یەکسەر پێویستە بـوونی
یـــانێ واجـــبە و نـــابێ نـــەبوونی
یـــاخود مــــومکینە و قـــابیلە بـــبێ
هــەروا قــابیلە نــابوود بــێ و نــەبێ
یــاخود بــەعزێکــی واجــبە بــوونی
بـــاقی مــومکینە بــوون و نــەبوونی
ئـــەووەڵ و ئــاخر هــەردوو بــەتاڵن
بـە عـەقڵی سـەلیم هـەردوو مـەحاڵن
ئــەوەی کــە ڕاستە حـاڵی دووهــەمە
لای عەقڵێ ساغ بێ باش مـوسەڵلەمە
جا با لێی بـدوین بـۆ تـەحقیقی حـاڵ
هـــەتا بگـــەینە مــەرتەبەی کــەماڵ

❊ ❊ ❊

بە شێوەی قەتعی سابت بێ لەلات
کــە واجب نـییە ئـەجزای کـائینات
ئـــەبینی زەوی بــەهۆی تــەکـانێ
ژێرەوژوور ئــەبێ لە هــەر مـەکـانێ

بـە چـەن دەقـیقە بـاش وێران ئـەبێ
بە نەوعێ ئینسان لێی حەیران ئەبێ
شاخێ ئەڕووخێ بە چەن دانـەمیت
شارێ ئەسووتێ بە دەنکێ کـیبریت
دەریـا وشك ئـەبێ، ئـەبێ بـە سـارا
عــەرزێ ڕۆ ئـەچێ ئـەبێ بـە دەریـا
خـۆ ئــەگـەر زەڕڕە[1] بکـەوێتـە کـار
بەرگەی ناگـرێ نـە شـار نـە کـۆسـار

❊ ❊ ❊

بــە فــەن[2] ســابتە ڕۆژ لە ئـاسمان
کــە ســاغ دیـارە لەپـێش چـاومان
هــەتا شــەوێ دێ و ڕۆژ ئـەبێتـەوە
بــە مـیلیۆن زەڕڕەی کـەم ئـەبێتـەوە
کــە ئــەمەت زانــی بـزانـە نـابێ.
فــەرقێکــی وەهـا لە ئـەجزادا بــێ
بــازێکـی وابــێ واجب بــێ بـوونی
بـازێ مـومکین بـێ بـوون و نـەبوونی
«کُل» وینەی «جُزء»ە بێ شوبهە و گومان
ئـەویش وەکـوو ئـەم ئەشێ بۆ نـەمان
مــەڕوانــە زلی عــەرز و ئـاسمان
بــەرزتر ئــەڕوا هــێزی بــاسمان

١. ئەتۆم.

٢. زانست.

هێز هێرشی کرد هەمووی یەکسانە
زۆربەیان ڕامی هێزی ئینسانە
ئینسانیش بۆخۆی گیرۆدەی ئێشە
جارجار گیرۆدەی نیشی یەك مێشە
وا بۆ تۆ دەرکەوت سەراسەر جیهان
هەمووی مومکینە، زاهیر و پەنهان

❊ ❊ ❊

بە لایێ‌ترا چاو بکەرەوە
لە وەزعی عالەم ورد ببەرەوە
عەرز و ڕۆژ و مانگ، باقی ئەستێرە
کە چاو بە دینی[1] دیمەنیان تێرە
هەموویان ڕامی پەروەردگارن
بۆ فەرمانی خوا فەرمانبەردارن
بە یاسا و میزان وان لە هاتوچوو
لانادەن لە ڕێ بەقەی تاڵێ موو
شتێ هەڵسووڕێ بەوێنەی پەرگار
نابێ واجب بێ لای عەقڵی هۆشیار
مومکینە و کزە وێنەی خزمەتکار
واجب «آمِر»ە و «قادر»ە و «قهّار»

❊ ❊ ❊

۱. واتە: دیتن.

## باسی پەیدابوونی عالەم

دیســـــان ئـــەمانە تـــۆ ئـــەیانبینی
ئـەگـەر بــەڕاستی چاوێ هـەڵێنـی
هــەمووویان پــڕن لە حــەوادیســات
تاریکی و ڕوونی و دەورە و حەرەکات
شــتێ هــاوملی بــەندی «احــداث»ە
خۆیشی «حـادث»ە، ئـەم بـاسە ڕاسـە
«حادِث» ڕشـتەکـەی بـا زۆر درێژ بـێ
ئـینسان لە زەبـتی ئـەوەڵی گـێژ بێ
بـەڵام هــەموویان عــەدەم لە پـێشـن
بە فـەنای دوائیش گیرۆدەی ئـێشـن
شــتێ هـەمیشە لەگـەڵ حـادیس بـێ
ئـەبێ مـومکین بـێ، نـابێ واجب بـێ



ئـەگـەر تـۆ بـڵێیت «مَعروض» قـەدیمە
واجـــبە بــــوونی و پـایەی عــەزیمە
بـەس حـاڵەکـانیان وێنـەی حـەرەکـات
یەك یـەك نـیشتەجێ لە ڕووی کـائینات
یــــانێ پــــێویســــتن بــۆ ئــەو زاتــانە
ئــــەم «عــــوارض» و حــــەرەکــەتانە

ئـەمجار پـێت ئـەڵێم: وا ئـیقرارت کـرد
خۆت بە دەمی خۆت زوو ئیزهارت کرد
ئـەم «مَـعروضات»ە هـەموو مـوحتاجن
بـۆ بـوونی «عـارض» گشت نـاعیلاجن
دیـاریشە واجب نـابێ مـوحتاج بـێ
بـــۆ بــوونی شــتێ وا نـاعیلاج بـێ

* * *

بـــەڵێ ســـیفەتێ کــە هــۆی کــەماڵ بــێ
«فَلَك»ی[1] لە مەوسووف بە حەق مەحاڵ بێ
مـــــادام نـــافەوتێ و هـــاوڕازی زاتـــە
ئـــــەویش قـــەدیمە و لە کـــەماڵاتـــە
دڵت تـــێك نـــەچێ لە وەزعـــی سـیفات
هـــەن و نـــافەوتێن وێنـەی حـەرەکـات

* * *

کـاتێ حـاڵی بـووی سـەراسـەر جـیهان
هــەمووی مـومکینە، زاهـیر و پـەنهان
شـــیاوە لەبـــۆ بـــوود و نـــابوودی
هەڵئـەگرێ عـەدەم وێنـەی وجـوودی
نابێ بە «صُـدفە»، یـانێ بـە هـەڵکـەوت
وەربگرێ وجـوود یـا نـەبوون و فـەوت

١. جیابوونەوە.

یـەکـتا لە دووتـای تـرازووی مـیزان
خـۆی نـاکـەوێتـە خـەفتان و خـیزان
دووتـای تـرازووی هـاوسەنگ و مـیزان
قـەت دانـاکـەوێ هـیچ تـایێ لەوان
هـەروا مـومکینات نـابێ بـێتـە جـێ
بـوون یـا نـەبوونی بـەبێ خـاریجێ
«خارج» لە مومکین خواستی خـودایـە
ئـەمە وەربگـرە، حـەقیقەت وایـە
هـەتا حـەیوانـێ بـبینێ[1] خشـەیێ
لە سـەرەڕێـیێ، لەنـاو بـێشـەیێ
زوو ڕائـەوەستێ ئـەسڵەمـێتـەوە
نـەکـا بـە دەردی ئـەو بـتلێتـەوە
یـانێ ئـەزانـێ ئـەو خشـە نـابێ...
بـێ هـۆی خـەشاشێ لەوێ پـەیدا بـێ
چوون نابێ دەنگێ بەبێ خـاوەن دەنگ
هەرچەن دیار نـەبێ بـە قـەوارە و ڕەنگ
حەیوان وەرنـەگرێ دەنگـی بـێڕەوەن
چۆن تۆ وەرئەگری جـیهان بـێ خـاوەن
دەخـێلە لادە لەم سـووی ئـەوهامە
خۆت مەکە بە «کەو» ئەو بە «دێوجامە»



---

١. ببینێ: ببیسێ، بژنەوێ.

یــەکــێ بــبینێ شــتێ نـەو زوهـوور
لە ڕووی جــیهانا لە نــزیك یــا دوور
شــارێ، شــەقامێ، کـاسەیێ، جـامێ
قــەسرێ، هــەیوانــێ، ئـەگـەر بـفامێ
ســەرسام ئـەمێنـێ لە سـەنعەت‌کاری
ئــــافەرین ئــــەکـــا لە کـــاروباری
یەکێ پێت بـڵێ: ئـەم قـەسرە چـاکـە
یــا ئـەم هـەیوانـی بـەرزی، ڕووناکـە
خۆی بێ‌کەس بووە، بێ ئیشی میعمار
ئەو کەسە ئەگری بە مەسخەرەی شار
تــۆ چــۆن ئـەڕۆیـتە ژێر بـیری بـەتاڵ
جــیهان نــایەوێ خــوای بـە کـەماڵ!

❊ ❊ ❊

# ڕێك و پێکی لە بوونەوەردا

بــڕوانــە خــەیمەی بــەرزی ئاسمان
لە ڕۆژ و مــانگ و لە ئــەستێرەکــان
بەو نەخشانەوە کە فیکری «مانی»[1]
سەرگەردان ئەبێ لە شێوەی جوانــی
بە ڕۆژا هەتاو نــوور پــەخشان ئــەکا
بــە شۆڵەی دونــیا درەخشــان ئــەکا
لە شــــەوانــا مــانگ ئــێتــە تــریفە
ئــــەڵێی ڕوخســــاری یــاری لەتــیفە
لایێ «مــوشتەری» دڵت وەرئــەگرێ
لەلایــێ «زوهــرە» گــیانت دائــەگرێ
لەلایــێ «سیوەیل» مــیری خــەزانــە
لەلایــــێ «کــۆ»یــە، لایــێ «مــیزان»ە
لەلایــێ «جَــوزا»ی پشــتێنــە زیــوە
چــاوت جــوانێکــی وەهــای نــەدیوە
لایێ نەخشی «گا»، لەلایێ «گوڵ»ە
لەلایــــــێ «جــدیە» مــات و مــاتڵە
لەلایــێ «شــێر»ی بــەندی زەنجیرە
لەلایێ «قَوس»ە و «کەوان» و «تیر»ە

١. کابرایەکی چینی بووە کە لە وێنەکێشاندا زۆر بەناوبانگ بووە.

لەلایێ ڕێگەی بەرزی «کاکەشان»
هەندەسەی سەمات پێ ئەدا نیشان
حەسێب ناکرێ و ناژمێررێ بۆم
شێوە و تەرتیبی دەرئەکەوێ بۆم
هەموو بە شێوەی تەرتیباتی خاس
هاتوچۆ ئەکەن بە حەدد و میقیاس
بە میلیارێ ساڵ دائیرە و دەورە
تێك ناچێ ڕشتەی ئەم تەرز و تەورە
ئەمانە هەمووی شێوەی دیاری
نادووم لە کەشفی وەزع و ئاساری
لەسەر حەسێبی زەیج[1] و تەقویمات
بۆ وەزعی خۆشی و ناخۆشی وڵات
یا وەزعی جەووی لە سەرما و گەرما
لە بەفر و باران لە کاتی سەرما
یا ڕواندنی ئەنواعی گیا
بەوێنەی پۆشاك لەسەر ڕووی دونیا
یا بۆ تەولیدی کانی سەر زەوی
یا بۆ مەناخی[2] جێی بەرز و نەوی

❊ ❊ ❊

---

1. خشتەیەکە بۆ دیاری کردنی جموجووڵی هەسارە گەورەکان.
2. ئاو و هەوا، کەش‌وهەوا.

چـــاوی دایــــێنـــە بـەسەر دونــیادا
بـــڕوانـــە نـــزمی یـــا بـــە بـاڵادا
بـڕوانـە شـێوەی قـوللەی کـۆساران
لە چوار فەسڵەدا، مەخسووس بـەهاران
جارجـار چـارەڕەش، مـات و مـەبهووتە
وێنـەی هـەتیوی بـێ‌خـێوی ڕووتـە
بـێ‌ڕەنگ و بـۆیـە، بێ‌شـان و شێوە
سـەر تـا داوێنـەی سـاغ سـیاکـێوە
جـارجـار ئـەپۆشـێ سـەرپۆشـی بـۆران
ئـــەڵێیت نـازارە و ئـەڕوا بـۆ تـۆران
بە دەمەی سەرکێو، بە هەناسەی سەرد
وێنـەی غـەمباری دەروون پـڕ لە دەرد
جارجار ئـەبێتـە شـەخسی سپی پۆش
سـەر تـا داوێنـەی، لە کـەللە تـا گـۆش
ئـــەڵێت حـــاجییە و وا لە ئـیحرامـا
بـــە دەوری خـــانووی «دارالسّـلام»ا

❊ ❊ ❊

جارجار ئەگۆڕڕێ شێوەی سارا و کۆ
زیـنـەت و جـەماڵ دەرئـەخا بـۆ تـۆ
بـاران ئـەبارێ بـەسەریا بـە خـوڕ
لافـاو دەرئـەکـا لە دۆڵا بـە گـوڕ

وێنــەی دێوانــەی عــاشقی شــەیدا!
ئەکەوێتە دەشت سەر پڕ لە سـەودا
بـەبێ ئـارامـی، بـە ڕۆژ و شـەودا
بــە گوڕ سـەر ئەدا بـە دار و بـەردا
چەم خۆی لوول ئەدا دیـار بـە دیـار
بــەوێنـەی مـاری گـیرۆدەی زامـدار

❊ ❊ ❊

جارجار بە نـەشەی هـەوای بـەربەیان
نــەشئە ئـەبەخشێ بـە دڵ و بـە گـیان
ئــەهۆنــێتــەوە لە قــەترەی شــەونم
مــــلەوانــەی دوڕڕ بــۆ مــلی خــانم
شــەونم ڕیــز ئــەکـا لەسـەر گـوڵاڵان
وێنــەی عــارەقی ڕووی وردە ساڵان
بە سەفای مەوسم زەوی ئێتـە جـۆش
سەرچاوە و کانی گشت ئێنـە خـرۆش
فــــوارە ئــەکـا ئـاوی ســەرچـاوە
ئــەڵێیت «کـەوسەر» کـەوتە دونـیاوە
هــاژەی شــەتاو و قـەڵبـەزەی سـافی
بــۆ نـەخۆش ئـەبێ بـە دەوای شـافی
نــەسیم ئــەجووڵێ لەســەر نــەمامان
ئــەدا لە گـــۆنـای نـازکئەندامـان

ئــێنــێتـــە لەرە پــەڕەی گــوڵاڵان
بــۆ گــوڵاو پاشی گـۆنـای نـەوساڵان
ئـێنـێتـە خـرۆش بـولبولی شـەیدا
بە ساز و نەغمەی پڕ سۆز و سـەودا
ئـێنـێتـە سـەما عـاشقی بـێحـاڵ
بەوێنەی شێتێ بـۆی لێدەی شـمشاڵ
ئـــێنـــێ بـەیەکـا ڕیــزی چــناران
پــیت نــیشان ئــەدا وێنــەی دڵداران
کە ئـێن بـەیەکـا دەست ئـەکـەنە مـاڵ
لای دڵ نـــامێنـــێ ئـــارام و تــامڵ
سـەر ئـەخاتەدەر وەنـەوشە و نـەرگس
مــردووی پــێ ئـێتـە حـاڵی «تَـنَفُّس»
لایێ گـوڵ سۆسـەن، لایـێ نـەسرینە
وێنــەی نـموونەی ڕیــزی پــەروینە
چــیمەن بــە چـینی گــوڵاڵان ئــاڵە
زەردە و ســـیایە و نـــارنجی کـــاڵە
ئەبێ بە فەرشێ، وێنەی «ئیستەبرەق»
کـــافر ئـێتـە دەنگ بــە **«رَبُّـنا حَـق»**
هــەوا ســاف ئــەبێ بــەوێنــەی مـینا
کـێوت لـێ ئــەبێ بـە «طـور»ی سـینا
هــەرکوێ ئــەڕوانـی عـەکست دیـارە
ئـــەڵێی بـــارەگـای بـلوور تــەلارە

گشت گیانت ئەبێ بە قووەی شامە
گوڵ بۆنخۆش ئەبێ وێنەی شەمامە
هەوات بۆ ئەبێ بە عەتر و عەنبەر
بەوێنەی سینە و بەرۆکی دولبەر
جاربەجار باخات هەموو ئێتە بەر
بە مێوەی ئەلوان «الله اكبر»
پڕ ئەبێ لە خێر کەژ و کێو و دەشت
دونیا ئەبێتە نموونەی بەهەشت
ئەم هەموو وەزعە ئەم گشت ئەحواڵە
بێ هێزی خواتەحقیق مەحاڵە
عەرز هەر عەرزە، هەوا هەوایە
هۆی ئەم ئەحواڵە خواستی خودایە

* * *

# خۆناسین هۆی خوا ناسینە

ئـــەمە ئـافاق بـوو ئـەحواڵت زانـی
ئەمجا بێرە سەیر شەخسی ئینسانی

جـاریٚ بـڕوانـە مـاددەی وجـوودت
مـەکینە ئـەعزای بـە خـێر و سـوودت

چ لە دەمـــاخا، چ لە کـــەللەی سـەر
چ هـێزی بـیستن، چ نـووری «بَـصَر»

چ لەنـــاو قـــوڕگ و چ لە حـــەنجەرە
چ مـەعدە کـە هـۆی ژیـنی بـەشەرە

ئەجزای کەللەی سەر تا پەردەی دەماخ
بـاش ڕێکـخراوە بـە نـەزم و پـەرداخ

لە دەمـــاخەوە هـێزی نـووری چـاو
لە شـوێنـیٚ گـردە و لە دوو جیٚ بڵاو

دوو ڕەگ لەوێوە ئـێن، بـۆ بـینینە
چـاو وێنـەی گـڵۆپ سـاف و شـیرینە

دەزگـای کـارەبا و «مِـصباح»ی بـەرقی
دەماخ و چاوت بـوون بـە سـەرمەشقی

ئـەمجار بـێرە سـەر میزانـی حـەواس
سەرگەردان ئـەکەن دوکـتورانـی خـاس

سەیری زەنجیرەی پشتی ئادەمی
سەرگەردان ئەکا وەستای عالەمی
مەکینەی تەحلیل بۆ خوێن و «غَذا»
هێزی تەسفیە و تەوزیعی ئەعزا
بە کورتی شەرحی هەیکەلی ئینسان
پێویستە بەلای «تشریح الأَبدان»[1]

❊ ❊ ❊

ساتێکیش لادە لە «حِسّیات»ی
ڕوو بکە بۆلای مەعنەویاتی
بڕوانە وەزعی تەبعی ئینسانی
بڕوانە هێز و قووەی نەفسانی
بڕوانە بۆ دڵ سیڕڕی خودایە
هەزار ئەسراری عەجیبی تیایە
پارچەیێ گۆشتی سنەوبەرییە
سوورەتی بەڵام سیرەت پەرییە
کانی زانست و ڕەوشتی بەرزە
کاشفی سەما و ئەسراری عەرزە
بەوێنەی جامی جیهان نومایە
ئاوێنەی ڕەسمی هەموو دونیایە
ئەونە شیاوی بەرزی هیممەتە
جیلوەگای نووری «احدیّت»ە
پادشای موڵکی وجوودی تۆیە
فەرمانڕەوایە و هێزی بێ‌شۆیە

❊ ❊ ❊

هەنێ[2] دڵ ئەونە ساف و ئارامە
لە ناکامیشا هاوشانی کامە
حەقیقەت ئەبینێ و هەر حەق ئەبینێ
لە ڕێی ڕزگاری قەت دانامێنێ

١. زانستێکە توێکاری لەسەر لاشەی مرۆڤ ئەکات.
٢. واتە: هەندێ.

ئەگەر کۆسپێکی لێ کەوتە بەرپێ
بە بیر و باوەڕ لای ئەدا لە ڕێ
ئەگەر موشکلێ داوێنگیری بوو
بە حیکمەت چارەی ئەکا زووبەزوو
ئەگەر هەر قەزا هێرشی هێنا
بە ئیمانی خۆی ئەڵێ «رَضینا»
هەر بەو ڕەزایە و بە سەبر و تامڵ
ئەگا بە چارە و ئەگاتە مەنزڵ
کائینات لەلای ئەبێ بە بەهەشت
چاڵی بۆ ئەبێ بە پانایی دەشت
چونکی بە سەفای ڕەحمەت ئاوایە
خاڵی هەرچۆن بێ بەوێنەی شایە

❊ ❊ ❊

هەنێ دڵ هەیە بە شەڕ خەریکە
عالەم لەلایا تەنگ وتاریکە
لەبەر تاریکی تەپوتۆز ئەکا
بە ئەوین جادووی ئایین سۆز ئەکا
لە دەوری شەڕا مۆزەمۆز ئەکا
بە تای تانەی تاڵ جگەردۆز ئەکا
بە بەدچارەیی ڕوو لە جەنگ ئەکا
عیناد لەگەڵ حەق بە ئاهەنگ ئەکا

به کورتی وێنه‌ی فه‌رقی شێوه و ڕه‌نگ
قـه‌واره و قـامه‌ت یـا ئـاوازه و ده‌نگ
دڵی ئـــــاده‌می له‌یـــه‌ك جـــیایه
دڵی پـــــۆلایـــــه و دڵی مـــینایه
دڵێ تـــــاریکه و دڵێ ڕوونـــاکـــه
دڵێ نـــاپاکـــه و دڵێکـیش پـاکـه
دڵێ جـیلوه‌گـای جـه‌ماڵ و نـووره
ڕووی له باره‌گای «قُرب» و «حضور»ه
دڵێ ئـــه‌وه‌نده ڕه‌ش و بـــێ‌نـــووره
به دووری له حه‌ق شاد و مـه‌سرووره
ئـــــه‌م فـــه‌رقه زۆره‌ی له دڵانـــایه
له هـــه‌موو زه‌ڕڕه‌ی ڕووی جـیهانایه
بـــه‌ردێ له بـــه‌ردێ، دارێ له دارێ
کـێوێ له کـێوێ، شـارێ له شـارێ
بـه‌ڵگـێ له بـه‌ڵگـێ، گـوڵێ له گـوڵێ
ڕوومـێ له ڕوومـێ، قـوڵێ له قـوڵێ
ئـه‌مانه هـه‌موو ڕه‌هـنومای نـه‌فسه
عـالەم ده‌سکـاری زاتـی ئـه‌قده‌سه
ئه‌و به خواستی خۆی عالەم به‌ش ئه‌کا
یه‌کێ به جـوان و یـه‌کـێ ڕه‌ش ئـه‌کـا
مـــه‌به‌س ئـــه‌وه‌یه ئـــه‌و کـاروباره
ئـــاده‌می تـیایا مـــات و نـــاچاره

بە کورتی یانێ گشت ئەجزای جیهان
غەیب و شەهادە زاهیر و پەنهان
هەمووی مەوسووفە بە وەسفی ئیمکان
ئەڕوا بەسەریا هێزی لامەکان
بێجگە لە «حدوث» کاتێ هاتە ڕوو
دەرئەکەوێ بۆت فەرقی زووبەزوو

❊ ❊ ❊

یانێ موحتاجە سەراسەر عالەم
بە هێزی خالیق بێ زیاد و کەم
هۆی ئیحتیاجی وەسفی ئیمکانە
بۆ تەسدیقی دڵ باشی بزانە
«حدوث» بزانە بەهۆی ئیحتیاج
لە پەیدا بوونا بە «بُنیە» و مەزاج
یانێ بە ئیمکان بۆت ئەبێ «اثبات»
کە خوای پێ ئەوێ هەموو مومکینات
شتێ یەکسان بێ بون و نەبوونی
بە غەیری ئەبێ نەبون و بوونی
«حدوث» وەسفێکە کاتێ هەڵکەوێ
پێویستی فیعلی پێ دەرئەکەوێ
ئەنا مومکینات هەتا مەعدوومە
فاعیلی ناوێ، ئەمە مەعلوومە
خۆلاسەی کەلام نابێ بە ڕێکەوت
بڵێیت وجوودی کائینات هەڵکەوت

# ئایا ئەکرێ سروشت داهێنەری بوونەوەر بێت؟

**پرسیاری دووەم:**

مـامۆسـای زانـای ئـەم سـەربیساتە
«سَــــلَّمْنا»[1] عــالەم لە مــومکیناتە
«مُمکِن» و «حادِث» کاتێ هەڵکەوێ
بــە شـێوەی قـەتعی فـاعیلی ئـەوێ
بــەڵام ئـەم بـیرە بـا حـەقیقەت بـێ
فــاعیلی عــالەم هــەر تـەبیعەت بـێ
بــا تــەبیعەتی عــالەم ســەراســەر
خاوەن تەئسیر بێ لەم دونیا یەکسەر

**وەڵام:**

شاگـردی عـەزیز ڕۆڵەی دڵبـەندم   خاوەن شعووری شاهان پەسەندم
تــەبیعەت نـابێ ببێ بـە فـاعیل   نە لەبۆ ئەجزا، نـە کـوللی شـامیل
ئــەهلی تـەبیعەت بـە ئـیشتیباهن   لە ڕێگەی ڕاستی تەواو گومڕاهـن
حوکمی ئەوهامە و فکـری بـەتاڵە   لە تـــەبیعەتۆ تــەئسیر مــەحاڵە
بۆ باسی ئەمە بە کورتی و ئـاسان   دەلیلێ ئـەڵێم مـەقبووڵی ئـینسان

❊ ❊ ❊

ئـــەم تـــەبیعەتە یـــا هـــەر عــالەمە
یـــاخود هـــێزێکـــە کــە لەوا گــومە

---

١. دانمان پێدا نا، ڕازی بووین.

یـاخود هـێزێکـە کـە جـیایە لەمـان
«صـانِع»ە لەبـۆ هــەموو ڕووی جـیهان
ئـــەگــەر تــەبیعەت عــەینی عــالەمە
ئـــەئسیری بــۆ خــۆی نـاموسەللەمە
چــونکی لازم ئــێ شت کـاتی نـەبوون
ببێ و خۆی بکا بە «موصوف» بە بـوون
جا چۆن وەرئەگرێ هۆشی بێ‌جنوون
گـرد بـبێتــەوە نـەبوون لەگـەڵ بـوون
لەوکـــــاتا نــیيە وجـــوودی بـــبێ
لە نـــەبوونیدا بــوون بـێنـێتـە جـێ
بــــوون و نـــەبوونی گـــرد نـــابنەوە
بـــەڵکـــوو نـــزیکی یـــەك نـاکـــەونەوە

❊ ❊ ❊

ئـەگــەر تــەبیعەت مــانای دووهــەمە
یـــانێ هــــێزێکـــــە وا لەم عـــالەمە
ئەڵێم ئەم «وَصـف»ە مـوحتاجی جـێیـە
تا «مَـوصُـوف» نـەبێ وەسـفی لەکـوێیـە
دەی چۆن مەعقوولە شتی پاشکەوتوو
بـبێ بـە «صـانِع» لەبـۆ پێشکـەوتوو
ئـــەم ئـــیحتیماله لەویـــان پـــەنتره
لە بــــێنـــی عــــەقلا بـێنـی گــەنتره

❊ ❊ ❊

ئـەگـەر بـە مـانای سـێهـەمین یانە
یـانێ هـێزێکـی خـارج لەوانـە
ئـەڵێم ئـەم هـێزە ئـەگـەر زەعـیفە
لە کـــەماڵاتـــا پـایەی خـەفیفە
بۆ خۆت ئەزانی نـاشێ بـۆ «تَأثـیر»
چونکی داماوە و موحتاجە و فەقیر
ئـەگـەر کـامڵە بـە هـەموو بـارێ
قـــابیلە لەبـــۆ هـــەموو ئـاسارێ
یـانێ «اوصـاف»ی کـەماڵی هـەیە
لە عـەیب و نـوقسان زاتـی بـەرییە
وا هـــاتیتە سـەر پـانایی جـادە
ئـەمە تـۆ ئـەیڵێیت «**ربّ العـباد**»ە
حاجەت بە دەرزی ڕێی قەتعی ناکا
کورد بیدوێنە شەرعی خۆی ئەکا
ئەوەندە هەیە بە ڕووی حەقیقەت
من ئـەڵێم خـودا، نـاڵێم تـەبیعەت
تـــەبیعەت واتـــەی بـــێ ئـــەدەبانە
قسەی سەرەڕێی دوون مـەشرەبانە

* * *

بـــەڵام بـــەمانای هـــێزی عـــالەمی
خالیقی «جَماد»، «حَیوان»، ئـادەمی

خارج لە عالەم، دوور لە مومکینات
تەبعەن خودایە بۆ گشت سەربیسات
تەفاوەت ناکا کوردێ بڵێ «نان»
فارسێ بڵێ «نون» بە لەهجەی تاران
چ بەسە وشەی تەبیعەت لارە
بەکار هێنانی زۆر نابەکارە
ئەخاتە بیرت مانای خۆڵ و خاك
ئەکاتە چاوت غوباری خاشاك
مەڵێ تەبیعەت، بفەرموو «خودا»
یانێ خودئایە و دونیا بەو پەیدا
بە تورکی «تگری» عەرەبی «الله»
بە کوردی «خودا»ی کامڵ و ئاگاه

❊ ❊ ❊

نازانی سیڕی ئەم ئیشتیباهە
بەهۆی تەبیعەت عالەم گومڕاهە
ئەبینن بازێ ئاساری دیاری
کە دەرئەکەوێ لە سەبەبکاری
لە بوخار هەور و لە هەوریش باران
لە باران گیا و گوڵی گوڵزاران
لە هەتاوەوە دونیا گەرم ئەبێ
بوخار لە چەرخی عالەم جەم ئەبێ

کاتێ کە شۆڵەی هەتاو کەوتە گەڕ
گیا وشك ئەبێ ئەمپەڕ تا ئەوپەڕ

❊ ❊ ❊

یاخود ئەبینن ئاجۆری نمدار
هەڵدێنێ دووپشك خاوەن ئێشی ژار
یا تاڵێ مووی سەر کەوتە ژێر خاك
هەڵئێنێ ماری ژاراوی ناپاك
یا بەهۆی زبڵ و پیسی ناو کۆڵان
کرم دەرئەچن، ئەکەونە جووڵان
یا بەهۆی سەرمای هەوای ئاسمان
بەفر ئەبارێ بێ حەدد و سامان
کە ئەمانەی دی ئینسانی فەقیر
لەبۆ تەبیعەت دائەنێ تەئسیر
نازانێ سەبەب غەیری فاعیلە
سەبەب بۆ گەلێ ئەشیا شامیلە
«فاعِل» سانیعە بە عیلم و قودرەت
لەسەر حیکمەت و لەسەر بەسیرەت
«صانِع» خالیقە، زاتی بێ عەیبە
زانای ئەحواڵی شەهادە و غەیبە
«خالِق» پێویستە کە تەوانا بێ
بە ئەنجامی شت تەواو دانا بێ

تـــەوانـــایێ وا عـــالەم ڕامـی بـێ
دونیا بە خـواست و بـە مـەرامـی بـێ
«خـــالِق» عـادەتی وایـە کـە دونـیا
دامــەرزێ لەســەر پـێوەنـدی ئەشیا
لە گـەرما بـوخار، لە بـوخارۆ هـەور
لە هــەورۆ بـاران ئـەڕوا دەوران دەور
لە بــاران گـــیا و دار و زەراعـــەت
لەمـانە سـەمەر بـۆ ژینی ئـوممەت
لە نــاو گـیانلەبەر دایـنا نـێر و مـێ
ئارەزووی جینسی زۆر وەیا کـەم بـێ
بــۆ کـــەوتنە یـــەك لەبـۆ نـەتەوە
لە گـیا و گـیانلەبەر بـەچکە کـەوتەوە
«﴿وَ آتَـــيْنَاهُ مِـــنْ كُـلِّ شَـــيْءٍ...
سَـــبَباً﴾ کَـما مِـــن ضَـــوءِ فَـیْءٍ»[1]

❋ ❋ ❋

لەبەر نەزانی و نـەپرسینی خـۆی
ڕێگەیێ تاریك دەرئەکەوێ بۆی
بـۆخـۆی نـازانـێ «مُؤَثِّر» چییە
لە پـــرسیاریش تـــاقەتی نـییە
«مـؤثّر» ئـەبێ دارای کـەماڵ بـێ
بوونی خیلافی مەیلی مەحاڵ بێ
«مؤثر» ئەبێ خۆی «مُستغنی» بێ
عالەم موحتاجی دەوڵەمەنی بـێ
لەم عـــەلاماتە کـە بـەیان کـرا
ئەسبابی عادی دوورن ئـەی بـرا

---

١. بەشێکە لە ئایەتی ٨٤ی سوورەتی کەهف، واتە: هەرچی بویستایە بۆی ئەسازان، وەک چۆن لە ڕووناکی سێبەر پەیدا ئەبێت.

دەی ڕووەرگێڕە لە «خَلْط»ی ئەسباب «مُسَبِّب» بگرە وەربگرە سەواب

* * *

با بۆت دەربخەم تەبێعەت پووچە
مایەی تەبێعی فەساد و سووچە
تەبێعەت ئەگەر خاوەن تەئسیر بێ
خاوەنی هێزی خەلق و تەقدیر بێ
ڕشتەی تەئسیری ئەبێ «دائِم» بێ
هێزی ئیجادی دائیم «قائِم» بێ
چونکی ئاسارێ بە مەحزی زات بێ
بە دەوامی زات ئەبێ ئیسبات بێ
«مَعَ أَنَّهُ» تەبێعەت سەد جار
وەزعی ئەگۆڕێ دەربارەی ئاسار
بە مانیعێ کەم بەرگەردان ئەبێ
تەبێعەت لە ئیش سەرگەردان ئەبێ
ئەڕوانی هەوا دایم هەوایە
تاوێ هەتاویش لە مەیدانایە
ساڵێ مەلوولین لە زۆری باران
ساڵێ بۆ نمێ ئەمرین بەهاران

* * *

بەڵێ ئەم دونیا لەسەر ئەسبابە
کۆشش بۆ ئەسباب مایەی «صواب»ە

خودا بە عادەت لە ڕووی جیهانا
ئەسباب دائەنێ لە گشت زەمانا
بە جووت گرتنی دوو لە نێر و مێ
نەتەوەی ئەوان جوان ئێتە جێ
حەتتا لە گیا دا نێر و مێ هەیە
دار پەیوەند کرا بەری پوختەیە
ئەنجامی کۆشش بەرزی ئینسانە
مایەی تەمەڵی پووچ و نوقسانە
نایەوێ واتە زۆر درێژ بکەین
دەماخ و سەری یاران گێژ بکەین
بەڵام بەڕاستی «مَبدأ» حیسابە
کلیلی ئەسباب «ربّ الأرباب»ە
تەلیسمی ئەسباب جادووی هاڕووتە
ئەویش گیرۆدەی نەگبەتی جووتە
ئەسباب پێویستن، ئەمما بە ڕاسی
«مَنشَأْ» خودایە ئەگەر بیناسی
بەبێ هەوێنی خواهیشی خودا
هیچ پەیدا نابێ لە ڕووی جیهاندا
کاتێ کە خواستی ئەبێ لەسەر کار
ئەشارێتەوە ئەسبابت یەکجار
ڕۆژت لێ ئەکا بە شەوی تاریک
شارێت لێ ئەکا بە ڕێگەی باریک

لە پــاش ڕاوێژ و عــەزمێکــی قــائیم
ئــەڕژێ بــە ســەرتا «**فَسْـخُ العـزائِـم**»[١]
وەیــــا کـــوسپێکت ئــەخاتە بــەرپێ
نــــایێڵێ هــەنگاو بــنێیــتە ئــەوجێ

❊ ❊ ❊

زۆر ئینسان هەیە بە هۆش و تەمکین
بــە ســەریا ئــەڵێن هــەزار ئـافەرین
شـــاياوە لەبـــۆ ئـیدارەی جـیهان
دانــایە بــە «سِـرّ» پـەنهان لە پـەنهان
بەڵام کە خواستی خودای پێ نەبوو
هەرچەن تێکۆشـی ئـەنجامی نـەبوو
چ جــایێ پـایە و مـەرتەبەی کـەماڵ
سـەرسام ئـەمێنـێ بـۆ ژیـنی مـنداڵ
خــۆیشـی لێ ئـەبێ بـە بـارێ گـران
ئـــەسوورێتــەوە دامــاو و حــەیران
مــوحتاجە حــەتتا بـە مـەرحـەبایێ
ئێتە سەر سەما بـە سـووسەی بـایێ

❊ ❊ ❊

بە عـەکسـی ئـەمە زۆر کـەسی نـادان
بێ زانست و فەن بێ هۆش و ویجدان

١. هەڵوەشانەوەی ئەو بڕیارانەی لەسەری سوور بووی.

خوا بۆی ڕێ ئەخا ئەسبابی ژیان
ئەبێ بە گەورەی گەلێ لە جیهان
بەبێ زەحمەت و کۆششی گیانی
ڕێك ئەخا مایەی خۆشی ژیانی
ئەمە ئەزانێ خاوەنی «انصاف»
ئەگەر بڕوانێ بە دڵێکی ساف
کەوابێ لێرا هێزێ مەعنەوی
هەیە بۆ عالەم لە بەرز و نەوی
لەسەر خواستی خۆی ئێته سەر ئیجاد
بۆ فیعلی «ما شاء» و حوکمی «ما أراد»
**«آمَنَّا بِهِ وَ صَدَّقْنَاهُ**
**سَمِعْنَا أَمْرَهُ وَ أَطَعْنَاهُ»**

## هەربوویی (ازلی)و هەمیشەیی (ابدی)بۆ سروشت ناشێ

**پرسیاری سێهەم:**

مامۆسای دڵپاك، خاوەن فکری ساف
بیرێتر هەیە ببیێ[1] بە ئینساف
مانای «طبیعت» با هەر عالەم بێ
بوونی واجب بێ و کەماڵی جەم بێ
با ئەزەلی بێ و ئەبەدی بوونی
دووربێ لە نەقسی فەنا و نەبوونی

١. ببیێ: واتە: ببیسە.

هـەر ئـەو خـالیق بـێ بـۆ ئـەو شـتانە
کـە پـەیدا ئـەبن لەم ڕووی جیهانە
پـێم نـیشان بـدە مـانیعی چـییە؟
بـە زاهـیر «مـانِع» لەم فکـرە نـییە!
توولەی مامۆستای بەرزی وەکوو تۆ
ڕەوح و ڕەیـحانە و نـەسیمی شـەوبۆ

**وەڵام:**

شاگردی سەربەرز، نووری چاوانم
مـایەی ئـاسایش بـۆ دڵ و گـیانم
لێرا چـەن «مـانِع» هـەیە لەپێشا
کە هۆشت ئەدەن بە نووکی نێشا
یەکەم: ئەوانەی دەسمان پێ ئەگا
هـەموو نـیشانەی فـەنا لێی ئەدا
پێم وتی هەتاو ئـەجزای ئـەفەوتێ
زەوی بە بورکان[1] زۆری ئەسووتێ
بـاقی ئـەستێرەی ئـەم ئـاسمانە
زیـاتر نـییە هـێزیـان لەمـانە
شتێ کە بشێ بۆ نەقس و تـەحلیل
نـاشێ بـۆ پـایەی خـالیقی جـەلیل

* * *

دووهەم: ئەمانە هەموو تێکـەڵن    لە گەلێ ئەجزای ماددی حاسڵن

١. بورکان: گرکان، «آتشفشان».

شتێ موحتاج بێ بە «أجزا» و «مَواد» ئامادە ئەبێ بۆ کۆن و فەساد
«واجب الوجود» نابێ وەهابێ کۆن و فەسادی لە ڕێگەدا بێ
نابێ ئیحتیاج داوێنگیری بێ «خلط» و «امتزاج» بەرەوپیری بێ

❋ ❋ ❋

سێهەم: گەر ئەڵێیت ئەم ئەستێرانە
هەموو واجبن لەم ڕووی جیهانە
بە میلیارد واجب ئێنە سەر شانت
ئەبێ بە ئازار بۆ دڵ و گیانت
تۆ لە واجبێ کەوتیتە سەودا
کە بوون بە میلیارد شێت ئەبی و شەیدا
ئیش بە واجبێ بە حەق ڕێکەوێ
«اَلباقی» لەغوە، نابێ دەرکەوێ
بێجگە لەمەیشە، لەپاش تەحقیقات
شعووریان نییە ماددەی سەماوات
ماددەی بێشعوور ناشێ بۆ ئیجاد
یا بۆ یاسایێ پڕ بێ لە ڕەشاد
یانێ مەوادی بێ گیان و شعوور
ناشێن بۆ خەلق و بۆ یاسا و دەستوور

❋ ❋ ❋

چوارەم: ئەمانە بە زات یا سیفات
ئەگەر نوقسانی ڕوویان لێ بکات

نــــابن بـــــە زاتـــــی «واجب الوجـــود»
ناشبن بـۆ خـەلق و ئـیجادی مـەفقوود
ئــــەگـــــەر ئــــەوانــە هــــەموو کـــامڵن
بـــۆ وەزعـــی واجب بـــە حـەق شـامڵن
یــــەکــێکـــیان بـــەسە و بـــاقی زیـــادە
ئیتر چۆن هەمووی بە وجـووب شـادە
ئیتر بۆ بە وەهم مەجموعەی شەمسی
ئـەکـەی بە واجب بـە پـایەی قـودسی
لادە لە «مـــجموع»، بــڕۆ بـــۆ «جـامِع»
با حەق دەرکـەوێ وەك بـەرقی «لامِع»
«اللهُ نُـــــــــورُ لِـــــــــلسَّمٰاوٰاتِ...
وَالْأَرْضِ وَ مٰـــــا فِـــــيالْـــغَیْبِیّٰاتِ»
بـێ‌عــــەیبی مـــاددە و تـێکـەڵی ئـەجزا
بــــێ ئــــیحتیاج و مـــاجەرای ســـزا
خــــاوەن کـــــەماڵی لازمـــــی زاتـــــی
«خٰـــــــالِقٌ حَـــــقّاً لِـــــلْکٰائِنٰاتِ»

* * *

# هۆکاری تەنیایی خوا چییە؟

**پرسیاری چوارەم:**

مـامۆسـتای زانـای ئـازا و ئامادە
«کَشّاف»ی ئەسرار، مایەی سـەعادە
ئـیمانم هـێنـا کـە خـودای عـالەم
ئەبێ خارج بێ لە عـالەم سـەرجـەم
خـاوەن بـێ لەبـۆ ئـەوسافی کـەمال
پاك بێ لە عەیبی ئەوساف و ئەفعال
ئـــیشکالێ ئــێستە لە دڵا مـابێ
ئــەمەیە: بــۆچــی ئــەبێ تـەنیا بـێ
«مــانِع» کـامەیە دوو پــەروەردگار
«خـالِق» بـن لەبـۆ جـەمیعی ئـاسار

**وەڵام:**

نـەوجەوانــی پــاك، نــەورەسـیدەکـەم
هـــێزی دەروون و نــووری دیــدەکــەم
دوو پـــەروەردگار نـــابێ بـــۆ عـــالەم
وەربگـــرە فکـــری ڕاست و مـوسەللەم
«تَـــعَدُّد» کـــانە بـــۆ فـیتنە و فـەساد
مـــایەی شـەراکـەت زایـعە و بـەرباد

ئــــەزانــــێ زانــــای خــــاوەن بــــەراورد
شــەریك تــێکــئەچن لەســەر شتی ورد
چ جــایێ شــتێ خــاوەن قــیمەت بــێ
بــە عــادەت خــاوەن ئــەهەمییەت بــێ
کەی بوون دوو شەریك بە میانەی ساف
بژین لە عــومرا بــێ غــەوغا و خــیلاف
بــــوونی دوو خـــالیق لەبـــۆ کــائینات
ئــــەبێ بــــە مــایەی هــەزار فــەسادات
یــەکــێ ئــەڵێ خێر، یــەکێ ئــەڵێ شــەڕ
یــەکــێ ئــەڵێ وشك، یەکێ ئــەڵێ تــەڕ
هــــەر ســــەر نــاگــرێ کــاری ئــەمانە
گــــەر لە عــــەرزایــــە یــــا ئــاسمانە
ئــەمجار مــیانجی ئــەبێ لەکــوێ بــێ!
ســولحی ئــەمانەی پــێ جــێبــەجێ بــێ؟
بــە کــورتی ئــەڵێم، بــە یــاسای عــادە
شــەراکــەت مــایەی شــەڕ و فــەسادە



# بُرهانُ التَّمانُع[1]

لادە دەلیـــلێ کـــە خـــەتابی بـــێ

بگـــرە بـــورهانێ کـــە حـــیسابی بـــێ

یـــەکـــێ لەمـــانە خـــواستی شتێ بێ

ئەویان «نَـقیض»ی ئـەوە خـواستی بێ

نـــابێ هـــەردوویان لەویـــا بـــێنـــە جـێ

یـــا هـــیچیان نـــەبن، مـــەحاڵ لازم دێ

چونکی «جَمع» و «مَنع» لەبۆ «نَقیضَین»

عـــەقڵەن مـــەحاڵە، قـەت نـایێتە بـەین

عـــەلاوە، هـــیچیان وجـــوودیان نـــەبێ

«عـــجز»ی دوو «اِلٰـهْ» لەویـا ئـێتـە جـێ

ئـــەگـەر هـەر یـەکـێ لەوان بـێتە جـێ

«عـــجز»ی تـــاڵبـــی ئـــەویان ئـێتـە جـێ

کـــــەوابـــێ ئـــەبێ خـــالیق تـــەنیا بـــێ

خاوەن هێز و خواست، ئاگا و بینا بێ

❊ ❊ ❊

١. بەرەنگاری و بەرهەڵستی دوو «خالق» لەگەڵ یەکدا، لەسەر کردنی کارێ.

## بُرهان التَّوارُد[1]

هەروا مانیعە لەبۆ «تَعَدُّد»
لە کاتی خەلقا وەزعی «تَوارُد»
بەم مەعنا نابێ هەردوو بە جارێ
بێن دروست بکەن «ذَرَّە» ئاسارێ
چوون هێزی یەکێ کافییە بۆ کار
ئەویان بێسوودە بۆ خەلقی «آثار»
ئەونە بەهێزە «واجب الوجود»
خواستی هاتە جێ حازرە مەوجوود
ئیتر بۆچیتە دوو پەروەردگار
یەکێ ماتڵ بێ و یەکێ خاوەن کار

* * *

ئەگەر تۆ بڵێیت با بە «اتّفاق»
یەکێکیان دانێین بۆ خەلقی ئافاق
یا بڕیار بدەن هەریەکێ لەوان
هاتە سەر «تَأثیر» بێبەش بێ ئەویان
ئەڵێم ئەمجارە ئیمکانی خیلاف
ئەبێ بە مانیع بە عەقڵ و ئینساف

١. کۆ بوونەوەی دوو «خالق» لەسەر کردنی کارێ کە یەکێك لەوان بەسە بۆ ئەنجامدانی کارەکە، ئەبێ بەهۆی بێکاری و پشتگوێ خستنی ئەویتریان، کە ئەمەش لەگەڵ سیفەتی «واجب‌الوجود»ی خوادا دژایەتی هەیە.

مــــادام «تَـمائُع» مــومکینە بــۆیــان
ئــیمکانی عــیجزیش ڕوو ئــەدا لێیـان
عیجزیش فیعلی بێ یاخود بە ئیمکان
مـــــەحاڵە لەبـــۆ واجب بــە عــەیان
مـــادام وەهـــا بــوو «تَــعَدُّد» نــابێ
چ بە ڕووی «واقِع»، چ بە «اِمکان» بێ

❊ ❊ ❊

لەم بـــــەیاناتە دەرکـــەوت بـــۆ ئـــینسان
بـــۆ عـــەقڵێ دوور بـێ لە دەردی نــوقسان
کــــە پـــەروەردگار بــۆ هـــەموو ئـــافاق
زاتـــێکـــی فـــەردە «مَـــعبود» و «خَـــلّاق»
خـــارج لە ڕشـــتەی هـــەموو مـــومکینات
بـــەری لە نـــوقسان، خـــاوەن کـــەماڵات
زیــندو و زانــا بــێ و خـاوەن خـواهیش بـێ
تـــوانـــای زاتـــی بـــە نـــومایش بــێ
تـــێکـــەڵی نـــەبێ «عـــجز» و دامـــاوی
بـــینا و شـــنەوا و خـــاوەن گـــۆیـــایی
بـــێ ئـــیحتیاج بـــێ لە هــــەموو عـــالەم
بـــێ شــوبهە و وێنــە، ڕاست و مـوسەللەم
چـــوون شـــتی مـــردوو یــاخود نــاتەوان
نـــابێ بـــە خـــاوەن ئـــەثسیر بـۆ جـیهان

بێ خواست و خواهیش، بێ «سَمع» و «بَصَر»
ناقیسە و ناچار لە خەلقی ئەسەر
هەرچی «ناقص» بێ زاتی یا کاری
ناشێ بۆ وەسفی پەروەردگاری

❊ ❊ ❊

ئەگەر ئینسانێ تێفکرێ دەقیق
ئەگات بەم عیلمە بە شێوەی تەحقیق
هەمووی کائینات، سەراسەر جیهان
ئەڵێ بە زمانی زاهێر یا پەنهان
کە پەروەردگار تاق و تەنیایە
یەکەم «مَبْدَأ»ی هەموو ئەشیایە
مەجمووعەی ئاسار هەموو کائینات
جەماد وحەیوان، هەموو نەباتات
نیزام و ڕشتەی کائینات یەکسەر
گۆڕانی وەزعی بە خێر و بە شەڕ
نەخشی جوانی عەرز و سەماوات
«نِظام»ی دەورە و یاسای حەرەکات
ڕاگرتنی وەزع بە هەزاران ساڵ
لەسەر «تَوازُن» بێ تێکچوونی حاڵ
هەموو شاهیدن خودا تەنیایە
پەروەردگاری دانا و بینایە

ئــــەو وەجـــاخانە کـــە کـــوژانـــەوە
گـــــەلیان بـــــە عـــەرزا هـــەڵپــژانـــەوە
خــانەدانــەکــان ئــارامگــای مــەردان
کە بوون بە شوێنی پەست و نـامەردان
«بیت الْعِلم»ەکان بـوون بـە جـەهلستان
کە بون بـە شـوێنـی سـوورەتپەرستان
ئــەو ســەردارانــە بـوون بـە خـدمەتکار
ئــەو نــۆکـەرانـە کـە بـوون بـە سـەردار
گــیرۆدەکـانی ئـەشکەنجەی گـەردوون
کە دەرچوون لە ژێر سەرپەنجەی نگوون
ئــەو غـەمبارانـە کـە دڵ پڕ غـەم بـوون
لەبــەر ڕەشــەبای غـەما پڕ تـەم بـوون
کــە بــە هـۆی شـنۆی بـای مـیهرەبانی
کـــەوتنە خـــۆشـــی ڕێی زیـندەگـانی
ئــەو بــێ نــاوانـە کـە بـوون بـە نـاودار
بوون بە سەربەستەی باسی لادێ و شار
پـــڕبـــە دڵ ئــەڵێن خــودا تـەنیایە
بەرزی و نـزمی عـام لەلای ئـەودایـە
گۆڕانی مەوسم چوار فەسڵەی زەمان
گـۆڕانـی جـیهان سـەر تـا بـە دامـان
کـلـێـلەی کـەوانـی بـەفری کـۆسـاران
کـــەشیدە وێنــەی ئـەبرۆی دڵداران

دەمە و تۆف و تەم لەسەر دیاران
خورڕەمی باران کاتی بەهاران
زەنجیرەی ڕووبار لەناو دەرانا
ڕەوانی جۆبار لە دێبەرانا
هاژەی قەڵبەزەی تافی سەربەرزان
شافەی ئاوی ساف سەر لقان لەرزان
قوڵەی ئاوی ساف لە سەرچاوانا
کۆڵەی فوارە لە سەراوانا
نمنمی شەونم لەسەر گوڵانا
چوون عارەق لە ڕووی نازک دڵانا
لێو ئەکەنەوە خودا تەنیایە
بە حاڵی عالەم ئاگا و بینایە
چووزەی دەرکەوتوو لەبەر کاوانا
سەوزەی سەرکەوتوو لەبەر ئاوانا
تاتای وەرکەمەر لەبەر شاخانا
شەوبۆی بۆ عەنبەر لەبەر زاخانا
باقەی گوڵاڵان لە گوڵزارانا
تۆقەی گیا لەناو میرغوزارانا
لالەی شەقایق ئاڵ نەعمانی
بەوێنەی لێوی لەعلی یەمانی
گوڵ سۆسەن بە ڕیز لەبەر مەغاران
وەنەوشەی پەلدێز لە پەرچ خاران

نەرگسی چاومەست جگەر سیا بام
سەربەست بەوێنەی دڵبەرانی خام
چــــرۆی وردەدار لەســــەر شـــاخانا
گـــۆپکـــەی ســـەمەردار لەنـاو بـاخانا
لالەی مــــوعەتتەر لەبـــەر چـاوانـا
لوولەی نـــــیلووفەر لە ســــەراوانــــا
ئـاس و یـاسەمین، سـەرو و سنەوبەر
شۆڕەبی شـەیدا و چـنار و عـەرعەر
نـــەوبادەی نـــەوتووڵ، ڕیــز نـــەمامان
چوون بـاڵای ئـاڵای نـازك ئـەندامـان
شـــــنۆی نـــەسیمی کـــاتی بـــەربەیان
ڕۆح ئەفزای غەیبی بۆسەر دڵ و گیان
هەموو ئێنە دەنگ لەم ڕووی دونیایە
کــــە پـــەروەردگار تـــاق و تـــەنیایە
ساوای سادەی ساف، لێو لەسەر مەمان
نـــیگای دایـــەکـــان، خـــاتر بـێ خـەمان
دایـــەی دوورکـــەوتوو لە ڕۆڵەی ئـــازیز
ڕەنگ زەرد بـــەوێنـــەی خـەزانـی پـاییز
بـــابەی دڵ کــەباب، بـــەسۆزی جگـەر
بـــە جـــەفای دووری فـورزەندی دڵبـەر
دەردەدارانـــــی بــــە ســــەبر و تـــامڵ
دڵ بـیمارانـــی خـــەستەی بـێ حـاسڵ

دڵ سافانی پاك دڵسەفحەی مینا
بە تەجەللای نوور چوون «طوری سینا»
بەوێنەی قومری سەرقەڵای بورجان
لێو ئەکەنەوە چوون لەعل و مەرجان:
خوا پادشای عەدڵ و دانایە
بە ئەحواڵی دڵ ئاگا و بینایە

## ئایا مرۆڤ پێویستی بە ئایین هەیە؟

**پرسیاری پێنجەم:**

مامۆستای بەرزی پایە بوڵەندم
هۆشیاری خاوەن خولقی پەسەندم
وا باوەڕم کرد بە پەروەردگار
تاق و تەنیا و تاك، بینا و خەبەردار
بەڵام پێم بڵێ بەشێوەی تەمکین
پێویستی چییە بەشەر بە ئایین؟!
ئادەمی «بِالطَّبع» زانا و هۆشیارە
بەسوود و زیان باش خەبەردارە
فەرماندارانیش کە فەرمانڕەوان
ئادەمی ڕامە بۆ هێزی ئەوان
حوکمی مەحکەمەیش بۆ هەموو عامە
ئیتر پێویستی شەریعەت کامە؟!

بـۆچـی پێویستە بـوونی ڕەهـبەران
کـیش و ئـایین و ڕێی پـێغـەمبەران

**وەڵام:**

بـینایی چـاوی جـیهان دیـدەکـەم
دارای ڕەوشـــتی پـەسەندیدەکـەم
پـێویستە بۆمـان بـوونی ڕەهـبەران
دیــن و ئـایین و ڕێی پـێغـەمبەران
بۆ چەن فـائیدە و سـوودی عـالەمی
کــە هــۆی پـیرۆزیـن لەبـۆ ئـادەمی
یــەکــەم: یــارمەتی عــەقڵی بـینایە
بۆ دەرکی ئـەشیا لەم ڕووی دونـیایە
یــانێ شــتی وا پـێویستن بـۆ ژیـن
بــەبێ ئــەوانــە بـە خـۆشـی نـاژین
دووهەم: یارمەتی عەقڵ و ویـژدانـە
بــۆ هــەر ڕەوشــتێ پـاك و جـوانـە
سـێهـەم: ڕزگـاری کـۆمـەڵی بـەشەر
لە هێزی هەوای کوشەندەی خـەتەر
چوارەم: ڕەهبەری عەقڵی هـۆشـیارە
بــۆلای ئــەو خــوایە پـەروەردگارە
بــۆ ڕۆژی جــەزا و تــۆڵەی کـردەوە
لەســەر ئـەوانـەی نـاوی بـردووە

جا با بە تەفسیل بۆت بکەم بەیان
هەتا دەرکەوێ فەلسەفەی ئەدیان

❊ ❊ ❊

ئینسان مومتازە بە عەقڵ و ئیدراك
بۆ ئەندیشەی چاك لەبۆ پیشەی پاك
تا ببنە ڕیشە لەبۆ پیرۆزی
بۆ ژینی بەرزی شادی و نەورۆزی
بەڵام ئادەمی کۆنە ساوا بوو
ئەوەی ئەزانێ لەبەر چاوا بوو
بەبێ یاری دین بە هەزارانساڵ
نەدەگەیشتە مەرتەبەی کەماڵ
جا بۆ تەربیەی نەتەوەی ئادەم
ڕەهبەری هەنارد خالیقی ئەکرەم
یانێ ئادەمی کرد بە ڕێنوما
بۆ باوەڕ بە خوای سەر زەوی و سەما
هەم بۆ یارمەتی و بۆ تێگەیانی
لەوەی پێویستە لەبۆ ژیانی
هەروەها هاتن بەو تەرز و دەورە
تا جیهان گەیشت بەم نەزم و تەورە
گەلێ لە ئەشیای بەسوود و زیان
کە زۆر پێویست بوون بۆ ماوەی ژیان

بـە وەحـی خـودا بـۆ پـێغـەمبەران
هات بۆ حاڵی بوون لە وەزعی جیهان
جـاکـە ئـادەمی گـەییە پایەی خـۆی
پـێغـەمبەرێکـی وای هـەنارد لەبـۆی
کـە ئـایینەکـەی بشـێ بـۆ عـالەم
ئـەو پـێغـەمبەرەیش بـبێ بـە خـاتەم

❊ ❊ ❊

پـێم وتـی ئـایین کـۆمـەڵـی هـۆشـە
عـەقڵ و ویـجدانـیش یاریان خـۆشـە
بـەڵام بـزانـە، عـەقڵی بـێ ویـجدان
ئـینسان نـاخاتە سـەر خـولقی مـەردان
هـەر خـاوەن ویـجدان مـەردی مـەیدانـە
خـاوەن ویـجدانـە بـەلاگـەردانـە
شەخسی بەویجدان خێر و شەڕی خـۆی
وێنەی ڕائـەگرێ لەگـەڵ غـەیری خـۆی
ویجدان بـوو بـە یار بـۆ عـەقڵی ئـینسان
ئـینسان ئـەباتە مـەرتەبەی ئـیحسان
بـەڵام ویـجدانـیش نـەخۆش ئـەکـەوێ
بـە گـێژی هـەوا پـەکـی ئـەکـەوێ
لە تـرسی شـتێ، یـا تـەمای مـاڵێ
یـا بـەهۆی پـایە و مـەنسەب و حـاڵێ

ئـــەکـــەوێتـــە تـــۆز بـــەملاو بـــەولادا
لە ڕێگـــــــەی ڕاســـتی ڕەوان لائـــــەدا
لەم حـــاڵا ئـــینسان بـــە هـــێزی ئـــایین
عەقڵ و ویـجدانـی خـۆی ئـەکـا تـەئمین
لائـــــەدا لە ڕێی نـــــەفس و شـــــەیتانی
ئـــێتـــە ســـەر ڕێگـــەی ڕاستی ڕەحـمانی
ئەگەرچی زۆرکەس نە عـەقڵ و ویـجدان
نـــە دیـن، نـایهێنـێ بـۆ ڕێگـەی ڕەحـمان
بـــەڵام ئـــەوانـــەی کـــە بـــەخت یـــارن
تـــا حـــــەددێ لەگـــەڵ ئـــاییـنا یـــارن
خـــۆلاســـەی کـــەلام دیـن ئـەبێ بـە هـۆ
کـــە عـــەقڵ و ویـــجدان بکـــەوێتـــە خـۆ

❋ ❋ ❋

زانـــاکـانی چـەرخ یـاسا دانـەران
گرۆی زانایان یـاخـود سـەروەران
یـــاسایان لەگـــەڵ هـەوادا ئـەڕوا
خۆ ئەخەنە پێش لەسەر مـاسیوا
ئەغلەب یاسایان بۆ خۆ بـەکـارە
سـوودی ئـوممەتێ لەویـا دیـارە
وایان دانـاوە ئـەو یـاسا و پـەندە
خۆیی بە پاشا خەڵکی بە بـەندە
بێجگە لەویشە گوێ بەگوێ ئەڕوا
لەگەڵ ڕەزیـلە و خـزمەتی هـەوا
بـــەڵام ئـــایینی خـــودایـی عـامە
لەبـۆ بـێگـانە و بۆ بـرا و مـامە

❋ ❋ ❋

عـــاقڵ ئـــەزانـــێ نـــەفسی ئـــینسانی
گـــەلێ حـــەز ئـــەکـا بـە شـەهوەترانـی

زۆر مـــوناسبە بـــە مـــوقتەزای زات
بۆ ئیشی پەست و پووچ و خـەرافـات
بە خۆشەویستی ژیـنی خـۆشـی خـۆی
ئەکـەوێتە ئـیش چـۆن ڕێکـەوێ بـۆی
بـــە ســـتەمکاری لەســـەر هـــەژاران
بـــە ئـــازاردانـــی گـــرۆی دەس داران
بـــە بگـــرە و بـــەردە، بکـوژ و بـبڕ
بـە دەس درێژی بـۆسـەر بـیری حـوڕ
بە ڕق، بـە کـینە و دووڕوویـی و نـیفاق
بـە شـەڕ و ئـاشـوب جـیدال و شـیقاق
یـــانێ ڕووی بـــۆلای تـــەنیا ژیـــانە
لای پـــایەدارە ئـــەم ڕووی جـــیهانە
بۆ غـەوغا و شـۆڕش تـەبعی شـەیدایـە
بـۆ شـەهوەتڕانـی سـەر بـە سـەودایـە
هـیچ نـابێتە هـۆی پـاکـی تـەبێعـەت
نـــایهێنـێتـەوە بـۆ ڕێی حـەقێقـەت
مـــەگـــەر پـیرۆزی ئـایینی قـودسی
تـــۆزێ دەس بـدا لە هـێزی نـەفسی
ڕیشـــەی ڕەزیـلە دەربـێنـی لە بـێخ
شـاخەی دەمـاخی داپـاچێ بـە تـێخ
بـە بـەرقی سـەفای کـارەبای ئـەنوار
دڵ بـــبرژێنـــێ لە کـوورەی ئـەسرار

ئـەمجار کـە بـڕژا شـەخسی ئـینسانی
ڕژا بــە ســەریا فــەیزی ڕەحــمانی
قـەت بـۆگـەن نـاکـا بـە گـەرمی هـەوا
ڕوو نــاکــاتە لای حـوببی مـاسیوا
ســـــەریشی بــبڕی لانــادا لە ڕێ
بـۆ دەسـتووری حـەق سـەری دائـەنێ
مـامۆستای دەرزی ئـەم عـیلمە بـەرزە
کـە بــەیانم کـرد بـەم تـوول و عـەرزە
هـــەر حـــەزەراتــی پـێغـەمبەرانـن
کـە بـە ئـەمری حـەق لە ڕەهـبەرانـن
بـە نـووری ئـەوان ئینسان پـێ ئەگا
دڵی لە «حـــقُّ اليَــقين» تــێ ئـەگـا
خـۆی پـێ لائـەدرێ لە بـاری تـاوان
لە شـوێنـی تـەنیا و تـاریکە شـەوان
ئـــەگـــەرنا بـڵێیـن سـەرۆك مـانیعە
لە حـقووقی نـاس بـاش مـودافـیعە
تـۆ لە خـودای خـۆت ئـەگـەر نـەترسی
کێ دەستت ئەگرێ لە هۆدەی شەخسی
بــەڵکــو ئـەتوانـی گــەلێ لە تـاوان
ئــاشکرا بـیکەی بـێ تـرسی ئـەوان
ســەرۆك ڕام بکــەی بــە مـاڵی دونـیا
قـازیش دەنگ نـەکـا لەگـەڵ ئـەغنیا

ئــیترکــێ مــەنعت ئــەکــا لە تــاوان
بــێ خــەوف و ڕجــا و لە خــودا تــرسان
تــایبەتی ئــەگــەر تــێك بــچێ جــیهان
«ســلطە» گــوێ نــەدا بــە کــاری تــاوان
یاخۆ هەڵکـەوێ «سـلطە» نـەخۆش بـێ
لە ڕێــــعایەتی بــەشەر بــێهــۆش بــێ
یا سەرۆك بـۆ خـۆی لە خـودا نـەترسێ
لە جـــەور و بـێداد هــەرگیز نــەپرسێ
کــەوابــێ هــەر دیــن ئــەمێنــێتــەوە
ئــــینسان لە تــــاوان بگـــێڕێتـــەوە
﴿وَ هُــــــوَمَعَكُمْ أَيْــــــنَ مَــا كُــنْتُمْ﴾
ئــەبێ بــە هــاوڕێ و لە ڕێ نــابێ گــوم
﴿إِنَّ رَبَّكَ لَــــــبِالْمِرْصَادِ﴾
ئــەتخاتە ســەر ڕێی پــاکــی ئــازادی
چــونکی ئــەم نــووری ئــایین و دیــنە
ڕەهــــبەری دیـــن و پـــیرۆزی ژیــنە
بــەهۆی ئــەئسیری نــووری مــەعنەوی
ئــەسووتێ هــەوای ڕەوشــتی نــەوی
حــــەتتا بــــە یــاری خــاوەنانی نــوور
دوور ئــــەبێتــەوە لە ئــیشی مــەنفوور
ئــەبینی کــەسێ کــە هــەستا و دانیشت
لەگــەڵ ئــینسانی بــەرزی بــە ڕەوشت

حـاڵی ئـەگـۆڕێ بـە نـەوعێکـی وا
سـوێنـد ئـەخۆی وێنـەی نیبە لەم نـاوا
بـۆیـە خـوداوەنـد ئـەڵێ بە ئینسان
بـبێ بـە هـاوڕێی کـۆمـەڵی ڕاسـان
سـوودی هـاوڕێیـی چـاکـان دیـارە
هـاوڕێی بـەختیار زۆر بـەختیارە
تایبەتی «مُحیط» سەرکەوت بـە ئـەدەب
بە دیـن و ئـایین، بـە بـەرزی حـەسەب
ئـینسان ئـەگـاتە کـەماڵی ئـینسان
بە ئەندیشەی باش، بـە پـیشەی جـوان
لەم بـاسە لادە دووسـێ دەقـیقە
بـۆ بـاسی ڕەهـبەر بـەڕووی حـەقیقە
خـودا خـەلقی کـرد سـەراسـەر جـیهان
فـریشتە و پـەری و تـایفەی ئـینسان
بـۆ نـاسینی حـەق لەبـۆ عـیبادەت
یـانێ بـەندەگی و مـایەی سـەعادەت
هۆی ئـەمەیش چـییە، بـاوەڕی ئینسان
بـە جـەزای تـاوان بـە تـۆڵەی ئـیحسان
یـانێ بـەڕاسـتی بـاوەڕی بـبێ
جـیهان تـێك ئـەچێ و جـیهانێ‌تـر دێ
پـاش مـردن بـەشەر زیـندوو ئـەبنەوە
لە دادگـادا گـرد ئـەبنەوە

بە ترازووی ڕاست حیسابیان ئەکرێ
کردەوەی چۆن بێ وا نیشان ئەدرێ
ئەوجا یا دۆزەخ، یاخود بەهەشتە
بە عەمەڵ یا عەفوو لەو کارە زشتە

❊ ❊ ❊

چوون مەعقوول نییە ژیان عەبەس بێ
ژیان هەر لەبۆ هەوا و هەوەس بێ
چۆن ئەبێ شەخسی کردەوە جوان
یەکسان بێ لەگەڵ خاوەنی تاوان
ئەم گشت بێداد و غەدر و کوشتارە
ئەم فڕوفێڵ و سزا و ئازارە
چۆن بێ لێپرسین هەروەها ئەڕوا
وەکوو حەیوانێ بمرێ لەو ناوا
یا خزمەتکاران لەم ڕووی دونیایە
بە گیان و بە ماڵ، بە جاه و پایە
چۆن بەبێ ئەنجام خاوەنی ئەڕوا
خێرێ نابینێ لە تۆڵەی ئەوا
مەگەر ئادەمی وێنەی حەیوانە
یا دار یا گیای بێ ڕۆح و گیانە؟!
نابێ، چوونکی عەقڵ باوەڕی وایە
لەپاش کردەوە کاتی جەزایە

مـــادام جـــەزا بـــوو لەبـــۆ گـــیانلەبەر
لە سینفی پەری و لە نەوعی بەشەر
بـــە حـــەتمی ڕاســـتە هـــاتنی ڕەهـــبەر
مەحزی ڕەحمەتە «بَعث»ی پێغەمبەر
بـــۆ دەربـــڕینـــی یـــاسای خـــودایـــی
چ بـــۆ کـــۆمـــەڵ و چ بـــۆ تـــەنیایی
لەبـــۆ ئـــەندیشە و کـــردەوە و ڕەوشت
بـــۆ تـــۆڵە و جـــەزا لەســـەر زیبا و زشت
لەبـــۆ ئـــادابـــی خـــودا پـــەرستی
لەبـــۆ ڕەوشـــتی بـــوڵەنـــدی و پـــەستی
لەبـــۆ چـــاودێری حـــەقی خـــوێشاوەند
بـــۆ حـــەقی هـــەژار لەســـەر دەوڵەمـــەند
بـــۆ ڕاگـــرتنی شـــێوەی ئـــابووری
حـــەقی وڵات و خـــەتی ســـنووری
بـــە ســـوپایێکـــی بـــەرزی بـــەهرەمەند
خـــاوەن ئـــایین و پـــاك و ئـــەرجومەند
لەبـــۆ بـــەیانی تـــۆڵەی قـــیامەت
بـــۆ بـــەرز و نـــزمی مـــەرتەبەی ئوممەت
لەبـــۆ تـــەرویجی زانســـتی بـــەسوود
بـــە نـــەوعی ئینسان بگـــا بـــە مـــەقسوود
بـــاش بگـــەیێنـــن وەحـــی ســـەماوی
لەســـەر ئـــەحکامی مـــادی و مـــەعنەوی

بـــە مـــوقتەزای دەور لە ڕووی ڕۆزگـــار
بـــاش ڕزگـــار بکـــەن بـــەشەر لە ئـــازار
جا هەرکەس لەسەر هۆش و فامی خۆی
بـەقەی خـۆی بگـا بـە مـەرامـی خـۆی
ئـەمە بـوو سـیڕی فـەلسەفەی ئـایین
کـە بـەیانمان کـرد بـۆ ئـەهلی تـەمکین

* * *

## بەڵگە لەسەر پێغەمبەرایەتی پێغەمبەران چییە؟

**پرسیاری شەشەم:**

ماموٚستای دانای خاوەن حـەقیقەت
ڕاستە، پـێویسـتە دیـن و شـەریعەت
بـــەڵام لە دڵمـــا مـــاوە ئـیشکالێ
ئـــەخاتە دەمـــاخ بـــەعزە مـــەلالێ
ئـەوەی داوای کـرد کـە پـێغـەمبەرە
بە ئەمری خـودا بـە حـەق ڕەهـبەرە
لە سەر ڕاستی ئەو دەلیلمان چییە؟
چۆن باوەڕ بکەین کە ئەو «نَبی»یـە؟

**وەڵام:**

نـــووری چـــاوانـم، ئـارامـی گـیانم
هـــێزی ئـەژنۆ و پشت مـایەی ژیـانم

عـــاقڵ ئـــەزانـــێ کـــە خـــودای ئـــافاق
قەت تەکلیف ناکا بـە «مَـا لَا يُـطَاق»[١]
کـــاتێ کـــە ویـــستی یـــەکێ لە بـەشەر
بـــۆ ئـــادەمیزاد بکـــا بـــە ڕەهـــبەر
هـــــەڵئـــــەبژێرێ ئـــــینسانێ ئـــــازاد
خـــاوەن ئـــەخلاق و دڵ پـاك و دڵشـاد
لە ڕشـــــتەیێ بـــەرز بـــە پـــێی زەمـــانە
بـــە ســـیما و ســـوورەت ئـــادەمیانە
دوور لە ئـــەحواڵی نـــاشیرینی پـــەست
خاوەن غیرەت و شەجیع و سەربەست
ئـــــەمجار بـــەرلەوە بـــیکا بـــە ڕەهـــبەر
مـــەشهووری ئـــەکـا بـە فـــەزڵ و هـــونەر
هـــەم بـــەعزێ ئـیشی خـارج لە عـــادەت
بە «ارهاص» ئەکا بـە هـۆ بـۆ حـورمەت
کـــاتێ وادەی هـــات بـــیکا بـــە ئـــیمام
یـــانێ پـــێشـــەوا لەبـــۆ خـــاس و عـــام
ئـــــەنێرێ بـــــۆلای جـــوبریلی ئـــەمین
پـــێی تـــەبلیغ ئـــەکـا ئـەحکامی ئـایین
ئـــــەمری پـــــێ ئـــەکـــا بـــیانگەیێنـــێ
ڕێی ڕاست بـە ڕاستی لە عـام بـنوێنـێ

١. ئەو شتەی کە لە دەسەڵاتی مرۆڤدا نییە.

جـــا ئـەو ئـینسانە خـاوەن جـەلالە
ئــیددیعا ئــەکـــا پـــایەی ڕیســالە
پاش ئـەوە خـودا لە ڕووی سـەربیسات
تـەئیدی ئـەکـا بـەهۆی مـوعجیزات
زیاد لە مـوعجیزات بـە ئـەخلاقی بـەرز
بە پیرۆزی خۆی دائەگـرێ سـەر عـەرز
بـــەشەر تــێ ئــەگــەن لە کــەماڵاتــی
رام ئـــەبن لەبـــۆ حـــوکم و ئـایاتی
بــۆ وێنــە کــاتێ نــەمروودی جــەببار
عـــەزاب بــە ئـاگـر ئــەدرا بــە ئـازار
ئــەویش ئـەمری کـرد بـە مـەئموورانـی
لەســـەر دڵڕەقــی و جـۆشـی تـوغیانی
کـــردیانەوە ئـاگـرێ بـــە وەحشـــەت
گـیاندار لە تـاوی ئـەکـەوتە دەهشـەت
جـــا ئـیبراهـیمیان هـاوێشـتە نـاوی
لە کـــاتی جــۆش و بــڵێســە و تـاوی
خودایش بـە مـوعجیزە لەبۆ ئیبراهـیم
بـۆی کـرد بـە شـوێنـێ ئـارام و سـەلیم
ئـیبراهـیم مـاوە وەکـوو پـەڕەی گـوڵ
بـێ خـاری جـەفا و بـەبێ دەردی دڵ

* * *

لای فیرعەونەکان «سِحر» دایر بوو
چاو بەست و جادوو لایان زاهیر بوو
لەبۆ ڕزگاری و سەربەرزی «موسیٰ»
بوو بە ئەژدەها عەساکەی موسا
بوو بە موعجیزە لە چەرخی زەمان
بوو بە هۆی باوەڕ بە دین و ئیمان

❊ ❊ ❊

هەروا لە چەرخی «عیسیٰ»ی «ابن مریم»
دوکتۆری باو بوو لەسەر ڕووی عالەم
لەبۆ موعجیزەی ئەم زاتە گەورە
لە ڕووی جیهانا لەو چەرخ و دەورە
کوێری سکوومای خۆش ئەکردەوە
یەك دوو جار مردووی زیندوو کردەوە

❊ ❊ ❊

هەروا لە چەرخی مەولای «اصفیا»
یانێ موحەممەد «ختم الأنبیا»
واتەی فەسیح و بەلیغ دایر بوو
لە بەرزی ئەوان عاقڵ حایر بوو
لەناو بازاڕ و نشینگا و نادی
گرد ئەبوونەوە ئەهلی بەوادی

بە خوتبەی بەلیغ، بە هۆنراوەی جوان
«فُصَحا»ی[1] عەرەب خۆیان ئەنووان
هەرکەس وتاریٚ بەرزی ببوایێ
پایەی سەرئەکەوت بەوێنەی شایێ
خوا بۆ موعجیزەی سەراسەر جیهان
ناردی ئایاتی موعجیزەی قورئان
بە لەفز و مەعنا تەئسیری ئەکرد
هەرکەسێ ئەیبیست ئەسیری ئەکرد

❊ ❊ ❊

## موعجیزەی پێغەمبەر

بێجگە لە قورئان بە چەن موعجیزات
خەلات کراوە لە ڕووی سەربیسات
بە تەسبیحی بەرد، بە «شق القمر»
بە دەرچوونی ئاو لە پەنجەی ئەنوەر
بە شیفای نەخۆش، بە دەس لێدانی
فووی شیفای «صرع»ی[2] و لێوەی شەیتانی
یا وەکوو سوجدەی داری تەڕ بۆ ئەو
شکاتی ئاهوو لە حوزووری ئەو
یا وەکوو نالەی کۆلەکەی مزگەوت
کە لەو دوور کەوتۆ، لە مینبەر سەرکەوت

١. ئەوانەی زمان پاراو و ڕەوانبێژن لە دەربڕیندا.
٢. فیَ، جۆرە نەخۆشینێکە تووشی هەندێ کەس ئەبێ، کەف دەچێنێ و بێهۆش دەبێت.

یا خود زۆر بوونی خواردەمەنی کەم
بەهۆی پیرۆزی ڕەهبەری عالەم
غەیری ئەمانەیش گەلێ موعجیزات
مەعلومن لەلای عولەمای «ثقات»[١]
چەن شتی غەیبی بۆیان بەیان کرد
فەتحی شارانی بە زمان ئیعلان کرد
هەموو هاتە دی وەکوو ڕۆژی پاك
چۆن پڕتەو ئەدا لە بەرزی ئەفلاك

❊ ❊ ❊

کەسێ هاودەمی ڕۆحی قودسی بێ
خودا موڕەببی خولقی نەفسی بێ
قیمەتی چییە «معجزە» لای ئەو
زەڕڕە ئەسووتێ بە تاوی پڕتەو
بەرد لە دستیا با بکا تەسبیح
«وَ إِنْ مِنْ شَيْءٍ إِلَّا يُسَبِّح»
پەنجەیێ خەلقی بۆ شەهادەت بێ
بە ئیشارەی ئەو با مانگ دوولەت بێ
ئەو دەستە سەخای تەی پێچایەوە
«ینبوع»ە[٢] لەناو پەنجەکانیەوە
دەستێ سەربەستی هێزی ڕەحمەت بێ
حەقە دەرمانی دەرد و زەحمەت بێ

---

١. زانایانی متمانه پێ کراو، پشت پێ بەستراو.
٢. کانی، کارێز.

دەمــــێ هــاودەمی «ابــن مــریم» بــێ
بۆ زامـی زەحـمەت ئـەبێ مـەرهەم بـێ
کـەسێ تـەقدیسی خـوا بـە حـەق بکـا
دار ســوجدەی ئـیکرام لەبۆ ئـەو ئـەبا
کـە دڵسـۆزی بـێ پـایەی ئـەخلاقی
دار چـــۆن نــــەناڵێ لەبـەر فـیراقـی
کەسێ ئەساس بێ بۆ عـەدڵی بیسات
چۆن نـەڕواتـە لای ئاهوو، بـۆ شکات
کەسێ ڕەحمەت بێ بۆ هـەموو عـالەم
«طـبعاً» زۆر ئـەبێ بـەو تـەعامی کـەم
کـەسێ کـە جێگـەی وەحـی خـوا بـێ
بــە گـەلێ ئـەسرار ئـەبێ دانـا بـێ

* * *

«عَـلاوە»، ئـینسان بـە شـەرتی ئـینساف
ئـەگـەر بـڕوانـێ بـە دەلیـلی سـاف
ئـەزانـێ خـولقی ڕەسـوولی ئـەکـرەم
گشت موعجیزە بوون لە دەورەی عالەم
ڕەحمەت لە ڕۆحـی عـەللامەی «ثـانی»
«سَــعد»ی نــاسراو بــە «تَـفتازانــی»
ئەو ئەڵێ ئەعلای موعجیزەی ڕەسـوول
هەر ئەخلاقی بوو بە تـەرزی مـەعقوول
وەکـــوو تـامڵ و غــیرەت و ڕاسـتی
ئـەستووری دڵ و عـەزیمە و خـواستی

عەفوو و چاوپۆشی لە تاوانباران
دڵسۆزی لەبۆ حاڵی هەژاران
خۆڕاگرتنی لە کاتی نەهات
پشتەسووری ئەو بە خوای کائینات
سەفای نییەتی بۆ هەموو بەشەر
لەسەر «اقتضا»ی ئایینی ڕەهبەر
عەدڵ و دادی ئەو لە ڕووی جیهانا
ساغی بەرەوڕوو یا لە پەنهانا
مودارای لەگەڵ نادان و مەغروور
ئیرشادی نەرمی بۆ شەخسی جەسوور
قنیاتی بە کەم لە هۆی ژیانا
دووری لە نەفسی خاوەن تەوانا
عیبادەتی حەق بە ڕۆژ و بە شەو
ئیستیقامەت و نەگۆڕانی ئەو
«شجاعَت»ی ئەو لە ڕۆژی نەبەرد
خۆ ڕاگرتنی لە تانەی نامەرد
موعجیزەی بە حەق ئەبێ ئەوە بێ
کە دەخڵی کەسبی ئەوی تیا هەبێ
ئەناکە نەبێ لەویا دەخڵی ئەو
خوا ئەیکا و دوورە لە زەحمەتی ئەو
یەکێ گیر نەخوا لەناو دڵ سەردان
نەکەوێتە ناو گەلی نامەردان
یەکێ تووش نەبێ بە جەفای نادان
سواری هەوا بووی بە هەوا شادان

نەبێ بە هاوڕێی خاوەن عینادان
ئالوودەی غەدر و جەفا و مل‌بادان
نازانێ چییە مەعنای مودارا
چۆنە ئێشی ژار لە دانی مارا
نازانێ چییە مەعنای دەردی دڵ
نازانێ مەعنای کارانی موشکڵ
کەسێ نەچەژێ غەریبی وڵات
دەردی بێ‌دەستی و بێ‌کەسی و نەهات
دەردی نەخۆشی و زەبوونی جەستە
دەردی بێ‌هۆشی لە لەشی خەستە
دەردی دوژمنی بەدئەندیشەی دڵ
چاك بە خراپ دیو، دڵ پڕ لە چڵقڵ
نازانێ سزای سەرکزی چۆنە
تێ‌ناگا جەفای ئەم چەرخە کۆنە
ئەو لەبەر خودا ئەمانەی گشت دی
کەچی ئەیفەرموو «**اللّٰهُمَّ اهْدِ...**»

❋ ❋ ❋

لەم کاتا دڵم جۆش ئەخوا بە کوڵ
بانگت لێ‌ئەکەم بە زمان و دڵ
بانگت لێ‌ئەکەم لە تاوی گیان
بە چاوی تەڕ و بە دڵی بوریان
ئەی بەندەی خودا پاشای بەندەکان
سەرداری سوپای حەق‌پەسەندەکان

مایەی پیرۆزی و نیعمەت و ڕەحمەت
ڕەهبەری ڕێگەی خێر و سەعادەت
ئەی پێغەمبەری مەحبووبی نازار
لە ڕێی خودادا وەرگرتووی ئازار
هەڵگرتووی سزای ڕەقیبی نابار
وەرگرتووی جەفای غەریبی دیار
ڕێمان لێ بووە بە لاڕێی باریك
ڕۆژمان لێ بووە بە شەوی تاریك
بەو دڵسۆزییە کە هەتە بۆمان
لابکەرەوە بە ڕەحمەت لێمان
سینەم پەرۆشە بە هەناسەی سەرد
دڵم نەخۆشە بە ئازار و دەرد
هەر تۆی لوقمانی دەردی دەروونم
ئەتۆی دەرمانی دڵی زەبوونم
دەسمە داوێنت وەك عەرەب: دەخیل
مەهێڵە بەندەت داکەوێ زەلیل
خودا کە تۆی کرد بە چرای عالەم
بووی بەهۆی شەرەف بۆ بەنی ئادەم
لەناو دڵمانا هەڵکە چرایێ
ببێ بە مایەی خۆشی و سەفایێ
«أَنْتَ الرَّئُوف الرَّحِيمُ الْأَمِين
جِئْتَ رَحْمَةً إِلَى الْعَالَمِين»

* * *

# بەڵگە لەسەر ئیعجازی قورئان چییە؟

**پرسیاری حەوتەم:**

ماملۆستای زانای بە عەقڵ و عیرفان
دەلیلت چییە موعجیزە قورئان؟!
کە ئیعجازیشت بۆ کردم مەعلووم
سیرڕی ئیعجازی بەیان بکە بۆم
من لەم هۆیەوە دڵ پەرێشانم
گەلێ موحتاجی کەشف و بەیانم

**وەڵام:**

نەوباوەی باغی عیلم و مەعریفەت
«نامی» بە ڕەشحەی[1] چاوگەی حەقیقەت
لەبۆ ئیسباتی ئیعجازی قورئان
دوو دەلیل ئەڵێم بەوێنەی بورهان
یەکەم: ئەمەیە یا پایەی قورئان
باڵاتر نییە لە واتەی ئینسان
یا باڵاترە لە هێزی بەشەر
ناگەن بە وێنەی تا ڕۆژی مەحشەر
نابێ یەکەم بێ، ئەنا زووبەزوو
وێنەیان ئەوت بەبێ یەك و دوو

١. پرژە.

ئـــەگـــەرنا بـۆچـی عـــەرەبی عـــەربا
گـــەلێ خـــوتەبا و زومـــرەی ئـودەبا
لە «مـــعارضە»ی بـــە وێنـــە دامـــان
بـــە ســـەرگەردانـی لە دونـیادا، مـان
کـــەوابـــێ پـــایەی قـورئان بـاڵایـە
وێنـــەی لە جـــینن و لە ئـینسان نـایە

* * *

دووهەم: ئەمەیە کە مێژووی جیهان
«مـعارض»ێکـی نـەدی بۆ قـورئان
ئـەمەیان لەبـەر بـەرزی قـورئان بـوو
لێرا مـەبەسمان تـەواو عـەیان بـوو
یـا لەبـەر مـەنعی زاتـی خـودا بـوو
لێرەیشا مەقسەد هەر بۆم پەیدا بوو
چـونکی وتـارێ لە قـودرەتا بـێ
خـودا بۆ وێنـەی ڕێگـەی نـەدابـێ
ئـەم ڕێ نـەدانـە ئـیشی خـودایـە
لەبـۆ یـارمەتی «رسـول الله»یـە
کەوابێ دەرکەوت «علیٰ کُـلِّ حـال»
قورئان «مُعجِز»ە بۆ ئـەهلی کـەمال

* * *

ئەمجار پێت ئەڵێم: ئـەسراری ئـیعجاز
بـۆ حـاڵی بـوونی بـرای سـەرئەفراز

یەکەمین ئەڵێم: حورووفی «هِجاء»
یانێ ئەلف و بێ، هەتا «اِنتِهاء»
دائیر بوون لەناو هەموو عەرەبا
چ لە خەتیبان چ لە «اُدبا»
هەموو وتاریان لەو حەرفانە بوو
ئیفراد و تەرکیب بەو لەفزانە بوو
کەچی بە قەتعی قسەی هیچکەسێ
شێوەی ئوسلووبی لە قورئان ناچێ
لێرەدا دەرکەوت بۆ خاوەن نەزەر
«اُسلوب»ی[١] قورئان دوورە لە بەشەر
کەوابوو ئەبێ قورئانی ئەکرەم
کەلامی حەق بێ بۆ خودای عالەم
وتارێکی وا لە «مَدح» و «ذَمّ»دا
یا لە پێویستی بەنیئادەمدا
یاخود لە باسی ئادابی دینا
یا لە بەیانی ئەسبابی ژینا
لە شێوەی واتەی ئادەمی دوور بێ
ئەبێ کەلامی «مَنبَعِ النُّور» بێ

❊ ❊ ❊

دووهەم: هەرکەسێ وتاری بەرزە
لە بەلاغەتا نایابی عەرزە

١. شێوە، چۆنیەتی.

هـــەر لە بـــابێکـــا بـــەرز و بـــاڵایـــە
لە بـــابێ تـــرا نـــاگـــا بـــەو پـــایە
وەکـــوو «فـــردوسی» بـــۆ شـــمشێر بـــازی
بـــۆ گـــورز و گـــۆپـــاڵ بـــۆ مـــەیدان ســـازی
یا وەکوو «سعدی» بۆ واتەی حیکمەت
بۆ جەوانمـــەردی پیاوی بـــە هـــیممەت
یـــا وەکـــوو واتـــەی شـــێخـــی «غـــزّالی»
لە بـــــەیاناتی بـــــاسی مـــــیسالی
یـــــائەهلی ئـــــینشا و ئـــــەدەبی زەمـــــان
یـــــا فـــــیداکـــــاران لەبـــــۆ نـــــیشتمان
بـــە کـــورتی هـــەرکەس خـــاسە بـــۆ بـــابێ
لە غـــــەیری ئـــــەوا بـــــەو تـــــەرزە نـــــابێ
بـــــەڵام ئـــــایاتی بـــــەلیغەی قـــــورئان
لە هـــــەر بـــــابێکـــا بـــــەدیعە و جـــــوان
چ ســـــەنا چ زەم، چ وەعـــــد و وەعـــــید
چ تەقدیسی حەق بـــۆ خـــودای مـــەجید
چ لە بـــــابەتی مـــــێژووی ئـــــادەمی
چ لە بـــــەیانی وەزعـــــی عـــــالەمی
چ لە حـــــیکمەت و ئـــــەمسالی عـــاما
چ لە بـــــەیانی ســـــاڵ و ئـــــەییاما
چ لە ئـــــیرشـــــاد و تـــــەمێی بـــــەشەرا
چ لە پـــــاداشـــــی خـــــێر و خـــــەتەرا

لە هەر بابێکا ئەڕوانی بەرزە
دوورە لە ئەهلی ئەم چەرخ و عەرزە
وتاری وابێ کەلامی حەقە
موعجیزی هەموو تەوانای خەلقە

❊ ❊ ❊

سێهەمین: لەسەر یاسای بەراورد
هەرچی وتاری ناسك بێت و ورد
ئەغلەب هەر بەهۆی موبالەغاتە
کە هۆی ئیعجابی ئەهلی بیساتە
یانێ ڕەنگ ئەکرێ بە درۆ و گەزاف
بە لادان لە حەق بەشێوەی خیلاف
بەڵام قورئانی خاوەن دەرەجات
کە بە بەلیغی لە غەیبەوە هات
هەتا بڕوانی بەشێوەی ئینساف
تیایا نابینی مسقالێ خیلاف
کەلامێ وابێ، «کَلامُ‌اللە»یە
موعجیزی بیری ئەهلی دونیایە

❊ ❊ ❊

چوارەمین: قورئان لە ئەخباری غەیب
گەلێکی فەرموو وابوو بەبێ ڕەیب
لە ﴿الٓمٓ غُلِبَتِ الرُّومُ﴾
کەمێ لەم باسەت بۆ ئەبێ مەعلووم

باسی ئەسراری نەفسی ئینسانی
باسی ئاسمان یا ئەختەرانی [1]
باسی تێکەڵی لە نەباتاتا
﴿فالِقُ النَّوىٰ﴾ لە کائیناتا
باسی ئازاریٚ لە هەواوە بیٚ
باسی بورکانیٚ، لە زەوی دەرچیٚ
باسی «تَوازُن» لە حەرەکاتا
باسی «رَواسی» [2] لەسەر بیساتا
هەموو غەیبی بوون، ئێستەش هەروەها
مەگەر فەن کەشفی بەعزێکی بکا
هێزی ئادەمی ناگا بەم پایە
ئێستەش کە چەرخت لە بیستەمایە [3]
کەوابیٚ بە دڵ ببە خاترجەم
کەلامی حەقە و موعجیزەی عالەم

❊ ❊ ❊

پێنجەمین: ئەڵێم وتارێکی وا
«جامِع» بۆ هودا، «مانِع» لە هەوا
پڕ لە وتاری ناسکی نازدار
پڕ لە حیکمەت و ئەمسالی «اعصار»
لە ئینسانێکی ناخواندەی «اُمّی»
بەبیٚ دەوامی مەدرەسەی عیلمی

---

١. واتە: ئەستێرەکانی.
٢. شاخی پتەو و جێگر.
٣. واتە: لە سەدەی بیستەما دەژیت.

لە شەش جیهەتی سەربیسات دووره

لە هـیزی نـزمی ئـادەم مـەستووره

کـەوابـێ ئـەبێ کـەلامی حـەق بـێ

عاقڵ بۆ حوکمی ڕام و مولحەق بـێ

❊ ❊ ❊

شـــەشەمین: ئـــەڵێم دەلیـــلێ نـــازدار

تـــێکــەڵ لە دوو بــەش لەســەر ئـیعتیبار

شەخسێ جامیع بێ بۆ فـەیز و ئـیحسان

دەرکــــــەوێ لەوا کـــەماڵی ئـــینسان

عــالەم بــانگ بکــا بــۆ تـەوحیدی خـوا

لە پـــــەرستاری ئـــارەزوو و هـــەوا

بــۆ بـیری ڕوونـاك، بــۆ کـردەوەی پـاك

لەبـــۆ ڕەوشـــتی پـەسەندیدەی چـاك

ڕوو نـــەکـــاتە لای ئـارەزووی دونـیا

دڵی مــەربووت بــێ بــە خــودای تـەنیا

تـــا دامـــەزرێنـــێ دەوڵەتـــێکـــی وا

تـــایدا بـــەشدار بـن هــەموو مــاسیوا

حـــەقی هـــەرکەسێ بـداتــە دەســتی

نـەگـا بـە کـەسێ تـەحقیر و پـەستی

مــونەووەر بکـــا ســـەراســەر ئـافاق

بـە نـەزمی عـەدڵ و بـە بـەرزی ئـەخلاق

بـــەوێنـــەی هـــەتاو دەرچـــێ بـــۆ عـــالەم
دڵســـــۆز بـــێ لەبـــۆ گشت بـــەنی ئـــادەم
زیـــــــانی نـــــەدا لە مــــاڵ و نـــــەفسی
مـــەگـــەر بـــە یـــاسای ئـــایینی قـــودسی
بـــێشك ڕەهـــــبەری خـــودای بـــێعـــەیبە
قـــــورئانەكـــــەیشی دەســـتووری غـــەیبە
خـــۆی چـــەنێ بـــەرزە بـــە مـــایە و پـــایە
دەســـــتوورەكـــەیشی بـــە عـــەینی وایـــە
خۆی چوون ئەخلاقی موعجیزەی عـامە
قـــــورئانەكـــــەیشی مـــوعجیزەی تـــامە
ڕەهـــــبەری عـــــام و ئـــــایاتی قـــورئان
دوو موعجیزە بوون لەسەر ڕووی جـیهان
بـــــۆیـــە وا تـــیپ تـــیپ گـــەلی عـــاقڵان
هـــــاتنە خـــــزمەتی شـــای زیـــندە دڵان
گـــــرد بـــــوونەوە لێی مـــوتیع و ســـامیع
ئـەویش بۆیـان بـوو بـە شـەمسی لامـیع
كـــــــاتێ بـــــڕوانـــــی لەم كـــــارەساتە
كـــــە بـــەو پـــەیدا بـــوو لەم ســـەربیساتە
بـــاش بـــاوەڕ ئـەكـەی ڕەســوولی ئـەمین
ڕەحـــــمەتی عـــام بـــوو لەبـــۆ عـــالەمین
قـــــورئانەكـــــەیشی كـــــەلامی حـــــەقە
بـــــۆ دیـــن و دونـــیا بـــەرزی و ڕەونـــەقە

کـــلیل بـــوو لەبـــۆ دەورەی «اِنـــقِلاب»
عـــالەمی گـــەیاند بـــە پـــایەی ســـەواب
هـــەروا ئـــەمێنـــێ هـــێز و تـــەئسیری
بـــە کـــەس نـــاکـــرێ قـــەلب و تـــەغییری
تـــۆزی غـــوباری جـــەهل و خـــورافـــات
هـــەرگیز لێڵ نـــاکـــا ســـەرچاوەی حـــەیات
دیـــنێ ئـــەساسی لەســـەر قـــورئان بـــێ
ئـــەبێ پـــیرۆزی نـــەوعی ئـــینسان بـــێ
دیـــنێ هـــاتبێ لەســـەر عـــەدڵ و داد
بـــەکـــارە لەبـــۆ گشت ئـــادەمیزاد
دیـــنێ ســـەراســـەر پڕ بـــێ لە ڕەحـــمەت
یـــاسایە لەبـــۆ جـــەمیعی ئـــوممەت
ئـــەو پـــێغـــەمبەرە پـــاکـــە ســـەربەرزە
قـــورئانەکـــەیشی بـــەو شـــێوە و تـــەرزە
مـــانگ و ڕۆژێکـــن لە ئـــاسمانا
پـــەرتەو ئـــەڕێژن بـــەسەر جـــیهانا

❋ ❋ ❋

# فەرقی موعجیزە و جادوو چییە؟

**پرسیاری هەشتەم:**

مامۆستای بەڕێز سەربەرزی زانا
بێ سەبەب نابێ شت لە جیهانا
سەبەب هاتە جێ ئەو شتە ئەبێ
یانێ موعجیزەیش بە سەبەب ئەبێ
ئیتر یانێ چی «خارق العادە»
کاتێ ئەسبابی هەبێ ئامادە
هەروا ئەمەوێ فەرقێکی جوان
لەناو موعجیزە و جادووی جادووان
یا «کاذِب» داوای ڕەهبەری بکا
کە موعجیزەی بوو کێ ڕەددی ئەکا
لەم مەوزووعانە بەیانم ئەوێ
دەرمانی دەردی گیانم ئەوێ

**وەڵام:**

شاگردی وردم ڕاستە قەت نابێ
بێ هەموو ئەسباب شتێ پەیدا بێ
بەڵام ئەسبابی ئەم موعجیزاتە
غەیبە و خارجی ڕشتەی عاداتە

خودا ئەیزانێ و هەر خودا ئەیکا
دەستی کاسبی کەسی پێ ناگا
با ئەسباب بێ، مادام نیهان بێ
لە ژێر قودرەتی خودای جیهان بێ
ڕاستە خیلافی عادەتی عامە
موعجیزی هەموو گەلی ئەنامە

❊ ❊ ❊

هەیە بەم شێوە فەرقێکی جوان
بەینی موعجیزە و جادووی جادووان
جادوو فەننێکە لەبۆ تۆ و بۆ من
ئەشێ دەسکەوێ بە کەسب و خوێندن
شت کە ئەسبابی فەننی و کەسبی بێ
خارجە لەوەی غەیبی و وەهبی بێ
غەیبی ئەسبابی هەر لای خودایە
هەر لە قودرەت و هێزی ئەوایە
پێغەمبەرەکان بێ دەخڵن لەودا
ئەونە ئەزانن بۆیان ڕوو ئەدا
بەڵام جادووگەر یانێ سیحرباز
بەهۆی فەننەوە ئەبێ بە فەنباز
بە هۆی «ریاضە»[1] کابرا فێر ئەبێ
بە مانگێ جارێ بە نان تێر ئەبێ

١. ریاضە: وەرزش، ڕاهێنان.

یـاخود هـەناسەی ئـەگـرێ زەمـانێ
وا مـومکین نـەبێ بـۆ هـیچ ئینسانێ
بــە هـۆی ڕیـازە و بـاری نـەفسانی
کـەشف ئـەکـا گـەلێ شتی نـەهانی
یا خـود بـە فـێر بـوون کـابرا ژار ئـەخوا
کــەچی زیــانی قــەتعەن پـێ نـاگـا

❊ ❊ ❊

عەلاوە سیحر و جادووی جادووکار
هـەرچـەن ئـەبێتـە مـەنشەئی ئاسار
وەکوو تێك چوونی تـەبعی ئادەمی
یــا ڕام کــردنی ئـیشی عـالەمی
بـەڵام گـەلێکـی لەسـەر ئـەوهامە
بـێ حـەقیقەتە لەم ڕووی ئـەیبامە
گوریس هەڵکێشـە بـە نـاو جـیوەدا
ئـەجووڵێ وێنـەی مـار و ئـەژدەها
بـەڵام مـوعجیزات گشت حـەقایقە
لەسـەر ئـیجادی خـودای خـالیقە
لێرا بۆت دەرکەوت بەبێ یەك و دوو
کە چییە فەرقی موعجیزە و جـادوو
بـەوێنـەی فــەرقی ڕێبـڕ و ڕەهـبەر
«الله اکــــــبر، الله اکــــــبر»

❊ ❊ ❊

لێرا پـــێویســـتە بـزانـــی جـوان    ئیشێ موعجیز بێ بۆ پێغـەمبەران
ئـــەوەیە کـاتی «تـحدّی»[1] ئـەوان    لە بـــەرابـــەری گـەلی کـافران
خودا بۆی ئەکا بە مەحزی تەوفیق    ئەبێ بە مایەی «تأیید» و تەسدیق
هەرچی بێتە دی بەبێ تەحەددی    هـەرکـەرامـەتە لەبـۆ مـوهتەدی
ناوی مـوعجیزە بـۆ ئـەم نـەوعانە    بە عـورفی خـەڵکـە بـاشی بـزانـە

❊ ❊ ❊

لە واتــەی بـاسی ڕیـازەی ئـینسان
دەرکەوت بۆ ئێمە سیرڕێکی پـەنهان
ئـەمەیە کـەشفی ئـەسراری غـەیبی
نابێ بە دەلیل بـەرزی و بـێ عـەیبی
هـەتا بـە زاهـیر شـەخسی کـەشفدار
بــە ئــەحکامی دیـن نـەیێتـە ڕەفـتار
چوون فەیزی ئیسلام نووری موبینە
دوورە لەو کــەسە پـیسە و بـێدیـنە
خـاریقەی فـاسق هـەر «اِستِدراج»ە
وەکوو پارەی قەڵب دوور لە ڕەواجە
بێ قەدر و پـیسە لەسـەر بـیری پـاك
فـاسق بـا بـفڕێ بـۆ قـوبەی ئـەفلاك
ئەبێ پـیاوی بـاش ڕامـی خـودا بـێ
تـــابیعی دیـنی «رســول الله» بـێ

---

١. «تحدّی»، لە ڕوودا وەستان، بەرانبەری کردن.

وەلی تـــەماعی بـــە دونـــیا کـــەمە
وەلی خـــاتری بـــە خـــودا جـــەمە
وەلی دڵســـــۆزە بـــۆ مـــوسوڵمـــانان
وەلی دەرمـــــــانە بـــــۆ دەردەداران
وەلی دەروونـــــی وێنـــــەی کـــارەبا
دڵ ڕائـەکـێشـێ و غـەم ئـەدا بـە بـا
هـــاوڕێی لە ئـەوهام پـاك ئـەبێتـەوە
دڵی بـــــە ئـــەنوار ئـــەگـــەشێتـــەوە
«قَـــــوْمٌ لَا یَشْـــقى لهُـــمْ جَـــلیسٌ
وَ نَـــــــــظَرُهُمْ کَـــــنْزٌ نَـــــفیسٌ»
ئـــەمەیە دەرزی بـــەرزی عـــالەمی
هـــــۆی ڕزگـــــارییە لەبـــۆ ئـــادەمی



## مەئمووری وەحی لە کام نەژادە؟

**پرسیاری نۆهەم:**

مامۆستای دەرزی کیش و ئایینم　　ڕەهنومای ڕێگەی «علم الیقین»م
ئەو جوبرەئیلە کە ناوت هێنا　　لە چ نەوعێکە لە خەلقی خودا
چلۆنی وەرگرت ئایاتی قورئان　　بۆلای خاتەمی گەلی ڕەهبەران
چلۆن بوو شێوەی تەعلیماتی ئەو　　لەبۆ ڕەهبەری بە نوور و پڕتەو

**وەڵام:**

نووری چاوانی جیهان دیدەکەم
خاوەن ڕەوشتی پەسەندیدەکەم
ئەو جوبرەئیلە ناوی هاتە بەین
لە باسی وەحی «ربّ المَشرِقَین»
لە نەوعی مەلەك فریشتە ناوون
لە ماددەی لەتیف دروست کراون
نە نێرن نە مێ، نە خاوەن خۆراك
فەرمانبەردارن بۆ یەزدانی پاك
وجوودیان لەسەر ﴿كُنْ فَيَكُون﴾ە
دوورن لە هەرچی سیفەتی دوونە[1]

١. پەست و نزم.

خۆیان ئەگۆڕن بە ئەشکالی جوان
بە ئەمری خودای تەوانای جیهان

❊ ❊ ❊

لەسەر مەعلوومات لە «نصوص»ی دین
مەئموورن لەبۆ جیهان ئافەرین
بە توولی زەمان فەرمانبەردارن
هەموو لە ئیشی خۆ خەبەردارن
وەکوو نووسینی کردەوەی ئینسان
وەکوو پاراستن لە نەفس و شەیتان
وەکوو پرسیار لە شەخسی مردوو
لەو باوەڕانە کە بوویەتی زوو
وەکوو یارمەتی شەخسی موسوڵمان
لەگەڵێ ئیشا لەسەر ڕووی زەمان
هەموو مەشغووڵن بە زیکری خودا
لەسەر ئەو شێوە بۆیان دانرا

❊ ❊ ❊

نۆزدە تایفە، یا نۆزدە نەفەر
مەئموورن لەسەر عەزابی «سَقَر»
ئەم نۆزدە سینفە لە مەلائیکە
سەرۆکەکەیان ناوی «مالِك»ە
بازێ مەئموورن بۆ باغی بەهەشت
ئارام و سالم بێ کاری وەحشەت

گەورەی ئـەمانە نـاوی «رِضـوان»ە

مەزهەری فەیزی خـێر و ئـیحسانە

❊ ❊ ❊

چوار سینفیشیان زۆر بە حورمەتن لای پەروەردگار خاوەن عـیززەتن

یـەکـەمیان گـەلی «مُـقَرَّبین»ن دووهـەم ناوبراو بـە «کَرّوبین»ن

سێهەم «روحانی»، چوارەم لەمـانە حـەمەلەی عـەرشن بـاشی بـزانـە

عەدەدیان چوارە لە دەوری دونـیا لەو دونیا هەشتن بە ئەمری خودا

❊ ❊ ❊

گـــەلی مـوقەڕڕەب چـوارن بـە دەلیـل

یـەکـەم «جـبرئیل»، دووهـەم «مـیکائیل»

سـێهـەم «عِـزرائـیل»، چـوارەم «اسـرافـیل»

لەســـەر ئـــایەت و حـــەدیسی جـەلیل

جـــــوبریل ئـــەمینی «ربّ العـــالمین»

بـۆ وەحـــی و تـەنزیل بـۆلای مـوڕسـەلین

مـــیکائیل لەســـەر ئـــەمری ئـــەڕزاقـە

ســیپِڕی حـــەواڵەی خـــودای خــەللاقە

عـــیزرائــیل لەســـەر گــیان وەرگــرتنە

ئـــــامادەی کـــاتی ئـــەجەل هـــاتنە

وەکـــو مـــەئموری چـــرای کـــارەبا

بـــە ئـــانێ نـــووری شـــارێ لائـــەبا

ئــەتوانــێ بکــا بــە «طَــرفَةُ الْــعَيْن»[١]
قــەبزی ئــەرواحــی ئــەهلی «خــافِقَین»[٢]
ئــیسرافــیل چــییە؟ مــەئمووری خــودا
کــە بــە نــەفخی سوور دونـیا تێك ئـەدا
«صـــور» لە ئــەحادیس بــەیان کـراوە
بـــەم نـــەوعە پـــێمـــان نـیشان دراوە
وێنــەی شــاخێکــە فــووی ئــەکــا پــیادا
بـــــەقەی گـــیانداران کـــونی واتـــیادا
مــەئموور بــەو شــاخا فــوو ئــەکــا دووجـار
بــە یــەکــەمجاریان گشت ئـەمرن گـیاندار
دونـــیا ســـاف ئــەبێ لە بــەرز و نــەوی
کـــێو ئـــەبن بــە تــۆز لە هــەوا و زەوی
پاش ماوەی چل ساڵ بە فووی دووهەمیان
زیـــندوو ئـــەبنەوە ســەرلەنوێ ئـینسان
ئـــێتــە پــێشــەوە مــەیدانــی حــیساب
تــۆڵەی کـــردەوە، عــیقاب و ســەواب
خـــودا بـــە نـــووری پـــێغـــەمبەرانــی
بــە ســەفای سـینەی گشت ڕەهــبەرانــی
بـــە نــووری لەفــز و مــەعنای قــورئانی
بـــە نـــووری دڵی قـــورئان خـــوێنـــانی

١. بە چاوتروو‌سکانێک.
٢. خۆرهەڵات و خۆرئاوا.

بــە خــوێنــی لەشــی شــەهیدەکــانی
بــە بــارە و بــەشی مــوجتەهیدانــی
بـــە نـــووری دڵی دڵســـۆزەکـــانی
بـــە دڵ ســـافانی پـــیرۆزەکـــانی
حـــەشرمان بکـــا لەگـــەڵ دۆســـانی
بـــمانخاتە نـــاو بـــاغ و بـــێســـانی

❁ ❁ ❁

## حەزرەتی جوبرەئیل چۆن وەحی وەرگرت؟

ئـەمجار بـێینـە سـەر باسی جوبرەئیل
کـە چـۆن وەرئـەگـرێ ئایاتی تـەنزیل
بـــزانـــە کـــەلام ســـیفەتی حـــەقە
لازمـــی زاتـــی فـــەردی مـــوتڵەقـە
پـاکـە لە شێوەی «حـروف و اصـوات»
وێنـــەی نـابینی لە ڕووی سـەربیسات
بـــەڵام بـۆ تـەنزیل بـۆلای ڕەهـبەران
بـــۆ گـــەیاندنی ئـــەوان بـــە یـــاران
وەکـــوو دیـــارە لە ئـایەی «مـلحوظ»
نـــەقشیان هـــەیە لە «لوح المـــحفوظ»
جـــا کـاتێ ویسـتی عـەللامی جـەلیل
ســـەفیر بـــنێرێ، یـــانێ جـــوبرەئیل

بــە ئــیلقای غــەیبی و هــێزی ڕۆحــانی
تــێی ئــەگــەیێنــێ حــوکمی سـوبحانی
لەسەر خواستی ئەو بەشێوەی «مَلحوظ»
ئــایەت وەرئــەگرێ لە «لوح المـحفوظ»
بــەبێ دەس لێدان لە ڕێگــای «وصــول»
ئــەیهێنــێ بــۆلای حــەزرەتی ڕەســوول
ئــــەمجار یــا زاتــی جــوبریلی ئــەنوەر
ئــــەڕواتــە شــێوە و ســوورەتی بــەشەر
وە یاخود ڕەسوول بـە قـووەی شـەخسی
ئــێتــە ســەر تــەبعی ئــەڕواحــی قـودسی
لەســەر ئــەم یــاسا ئــەم دوو شــەخسانە
هــەرچــەن ئــەو مــەلەك، ئــەمیان ئـینسانە
جــوبریل پــێی ئــەکرێ ئــیفادە وتــەعلیم
ڕەســوول وەرئــەگــرێ قـورئانی عــەزیم
ئــــەم ئــــایەتانە لە لەوحــــی جــەلیل
کــــە ئــەیانهێنــێ حــەزرەتی جــوبریل
وەحــیە و کــەلامی خــودای ئــەکــبەرە
جــــــــوبرەئیل لێرا تــــــەنیا ڕەهــــبەرە
خــودا بــە قــودرەت لە لەوحــا دایــنان
بــــێ دەخــــڵە لەوا فــریشتە و ئــینسان
هــەروا «صُــحُف» و «تَــورات» و «اِنــجیل»
هــــاتەجێ بـۆیـان هــێنـانی جــوبریل

ئـەوانـیش نـەقشن لە لەوحی ئەکبەر
دوورن لە دەخـــڵی فـــریشتە و بـەشەر
بـەڵام هـەر قـورئان لەفـزی «مُـعجِز»ە
عـــالەم لە وێنـــەی ئـــەودا عـــاجزە
مـــاباقی «کُـــتُب» دوورن لە ئـــیعجاز
ئـەگـەرچـی بـەرزن بـە پـایە و ئیعزاز.
حـەدیسی قـودسی بـە قـەدر و ئیعزاز
بێ دەخڵی جوبریل، بێ وەسفی ئیعجاز
بـــە لەفـــز و مـــەعنا لەلای خـوداوە
کـــەوتووەتە قـــەلبی «رســـول اللە»وە

❊ ❊ ❊

# باسی ئیلهام

غــەیری قــورئان و حــەدیسی قــودسی
لەوەی لە خوداوە ئەگەن بە شـەخسی
ئـــیلهام ســـابتە بـــە ئـــەمری خـــودا
لەلای خـــــوداوە بـــۆ «رســـول الله»
ئـــەمەیش لە ســیدقا و ێنــەی قــورئانە
دوورە لە هــەرچــی عــەیب و نــوقسانە
چــونکی ئــیلهامات بــۆ پــێغــەمبەران
وەحـــی خـــودایـە لەبـۆ ڕەهــبەران
بـــەڵام ئـیلهامی ئـەولیای ئـوممەت
چوون مەحفوز نییە لە شێوەی توهمەت
نابێ بە حوججەت لەسەر غەیری خۆی
ئینسان ئـەتوانـێ گـوێ نـەگـرێ لەبـۆی



«مـــا عَـــدا»ی وەحـــی و ئـیلهامی خـــودا
یـــانێ فـــەرموودە بـــۆ «رســـول الله»
هــــەرکام لەوانـــە کـــە «مـــتواتـــر»ە
بـــەوێنـــەی قـــورئان حـــوکمی زاهــیرە
ئـــینکاری لەفـــز و مـــانای ئـــەوانـــە
وەســـیلەی کـــوفرە، بـــاشی بـــزانـــە

ئەوەی «آحاد» بێ و ڕێك بێ لەگەڵ «نَصّ»
ئــــینکاری مـــەعنای نـــابێ بکـا کـەس
بـــەڵام لەفـــزەکـــەی چـونکی ئـاحادە
قـــابیلی بـــاسی ئـــەهلی «إســـناد»ە
ئـــەونە بـــزانـــە بـــۆ عـــەقیدە و دیـن
فـــــەرزە بگـــاتە مـــەرتەبەی یـــەقین
یـــا «مـــتواتـر» یـا ڕێکـی «نَـص» بـێ
بـەوێنـەی نـەسسی زاتـی ئـەقدەس بـێ
ئـــەمما بـــۆ ئـــەحکام ئـاحاد کـافییە
تـــەئسیراتـــی «ظَـــن» لەویـــا وافـــییە
ئـەمە دەرزێ بـوو لە هـۆی مـوهیممات
بـــاش وەریبگـــرە بـۆ دیـن و دونـیات
ڕەحـــــمەت لەو کـــەسە دڵســـۆزی عـامە
مـــاوای ئـــەو کـــەسە «دار السّـــلام»ە

❊ ❊ ❊

## بەڵگە لەسەر ئەوەی کە حەزرەتی موحەممەد ڕەوانەکراوە بۆ هەموو بەشەر

**پرسیاری دەهەم:**

مامۆستای دارای ئەفکار و ئەسرار　　دەرمـــانی دەردی بـیمارانـــی زار
دەلیلت چییە ڕەسوولی ئەکرەم　　ڕەهبەری عامە بۆ هەموو عالەم؟!
لە ڕێی خـــودا بـــە دەلیـلێ وا　　شیفای دەردم بێ، پێم بدە دەوا

**وەڵام:**

شـــاگـــردی وردم وەربگـــرە بـــە دڵ
پەڕەیێ بێنخۆش وێنەی پەڕەی گوڵ
وەربگـــرە دەلیـــل لە نـــەقلی سـەلیم
ڕەهـــنومای ڕێگـەی پـانی مـوستەقیم
هـــەروا دەلیـلێ عـەقلی بـێ و جـوان
کـە ئـەم مـەوزووعەت بـۆ بکا بەیان
لە نـــــەقلیـــاتا وەربگـــرە قـــورئان
﴿یـــا أَیُّـــهَا النَّـــاسُ﴾ بانگە لە ئینسان
عەرەب و عەجەم لە تورك و چەرکەس[1]
لە سامی و ئاری لە هەر شوێنێ هەس

❊ ❊ ❊

١. چەند تیرە و هۆزێکی بەناوبانگن.

بـــخوێنـــەرەوە ســـورەتی «اعــراف»
لێی ورد بـەرەوە بـە عـەقڵ و ئینساف
بانگی کـرد ئـەهلی تـەوڕات و ئینجیل
کـە ئـیمان بێنـن بە مـەولای جەلیل
ئــەو ڕەوانــە کـا بـۆیـان «**طَــیِّبات**»
لائـــەدا لێیـــان هـــۆی «**مُـــحَرَّمَات**»
ئـــەو فـــڕەی ئـــەدا لەســـەر شـــانیان
زەنجیری مەینەت لەسەر ڕووی جیهان
ئـــەوە بـــەندەی پـــاك بـــە بـیروباوەڕ
لەلای خـــوداوە بـــووە بـــە ڕەهــبەر
بـــخوێنـــەرەوە ســـوورەی «انـــبیا»
تا مـەقسوودی خـۆت دەرکـەوێ لەویـا
واریســـی عـــەرزن گـــەلی ســاڵحین
ئـــەحمەد ڕەحـــمەتە لەبـۆ عــالەمین
بـــخوێنـــەرەوە ســـوورەتی «سَـــبأ»
گـــــەردەلوولی دەرد لە دڵ لائـــەبا
﴿**وَ مَــا أَرْسَــلْنَاكَ**﴾ بـە خـیتابی خـاس
تــــەکــمیلەی ﴿**إِلَّا کَــافَّةً لِــلنَّاس**﴾

❊ ❊ ❊

هـــەروا لە نـــەقڵی وەربگـــرە نـــامە
کـــە هــۆی دەعــوەتی «خـیر الأنـام»ە

زۆر نـــامەی نـووسی لەبـۆ سـەرداران
بـــە حــەق بـانگی کــرد لە شــەهریاران
بـــۆلای «مـــقوقس» گـەورەی قـیبتیان
هـــەم بـۆلای «هــرقل» والی ڕوومـیان
بۆ گەورەی «بحرین»، بۆ گەورەی «عمّان»
دەعـــوەتی کــردن بـۆ دیــن و ئـیمان
هــەم لەبـۆ «کسـریٰ» گـەورەی ئێرانـی
خــوسرەوی پــەرویز، نـەوەی ساسانی
ڕوونـــــاك دیـــارە لەم نـــەوعە نـــامە
کـــــە ڕیســـالەتی «مـــحمّد» عـــامە

* * *

لە عـــەقڵیـــاتا وەربگـــرە دەلیــل
بـــا دانــەمێنـی بــەوێنــەی زەلیــل
مــوحەممەد داوای ڕیســالەتی کـرد
لەسەر داوای خۆی «حُجَّت»ی هاورد
یــەکەم: مـوعجیزەی ئـافاقی قـورئان
دووهەم: موعجیزەی ئەخلاقی جـوان
سێهەم: مـوعجیزەی ڕووداوی زەمـان
کـــە نـــاژمێررێن لەم کـاتا بـۆمـان
بــڕوانــە «سـیَر»، بـاسی مـوعجیزات
ئــەم حـەقیقەتەت بـۆ ئـەبێ ئـیسبات

* * *

بیرێکی شۆڕاو، شیرین بێ ئاوی
بە ئاوی دەمی کە کەوتە ناوی
کوێری سکووما ببێ بە بینا
کاتێ کە دەستی بە چاویا هێنا
خۆش ببێتەوە نەخۆش بە فوویێ
گرێ نایەڵێ بە قەدەر موویێ
چەن دانە خورما تا بیست و شەش ساڵ
یەکێ لێی بخوا بە ئارەزووی حاڵ
بەر لە کارەسات بە عیلمی بێ ڕەیب
پێمان نیشان داگەلێ کاری غەیب
بڵێ بۆ تۆیە پۆشاکی «کسریٰ»
بڵێ دائەگرین قوسووری «بُصریٰ»
بڵێ فلانکەس شەهیدی بەحرە
بڵێ «بوالفضول» مەترووەدی قەبرە
بلێ لە حیجاز ئاگرێ ئێتە دەر
تا دەشتی بوسڕا ئەکا مونەووەر
بڵێ خەلافەت ماوەی سی ساڵە
لەوەلا شایی و پایە و ئیقباڵە

* * *

هەموو ئەمانە یارمەتی غەیبن
هەموو موعجیزەی شاهی بێ عەیبن

نـە جـێی فـڕوفـێڵ نـە ڕێی ئـەسبابە
تـــەنیا تـــەئیيدی خـــودای وەهــهابە
زاتـــیّ ئـاوابــیّ مـوعجیزەی خـاسی
عـالەم ئـەیناسیّ بـە شـێوەی ڕاسـی
هـەرچی ئـەو بـیڵیّ دڵ وەری ئـەگریّ
بـە نـەوعیّ ڕێگـە، بـە شـوبهە نـەدریّ
ئـــەمجار بـڕوانــە بــە دڵی دووربـین
تــا بــەم نـەتیجە بگــەی بـە یـەقین
«أُرسِـــــلْتُ إلىٰ كـــافّةِ الثَّـــــقَلَین»
ڕاستە، بیّ شوبهە، ئەی نووری عەینەین



مــادام ڕیســالەی مـوحەممەد عــامە
ئــایینی پــاکــی دیــنی ئـیسلامە
بـــزانـــە ئـــیسلام بـــۆ بـەنی ئادەم
هـــۆی پـیرۆزیـیە لە کـورەی عـالەم
ئیسلام بانگ ئـەکا بـۆ حـەق پـەرستی
بــەشەر لائـەدا لە دوونــی و پـەستی
ئیسلام بـانگ ئـەکا لەبۆ عـەدڵ و داد
بـــۆ ڕەوشـــتی بـەرز بـۆ ئـادەمیزاد
ئـیسلام ڕەهـنومای ڕێگـەی ئیحسانە
ئـــیسلام ئـــایینی نـەوعی ئینسانە

مـەکـەونە دوای ئـەندیشەی تـەوهام
«عـــنصُر»ی[1] نـــییە ئـاینی ئـیسلام
ئــــیسلام وەکـــوو ڕۆژ لە ئـــاسمانا
پـــڕتـــەو ئـــەڕێژێ بـەسەر جـیهانا
هەرکەس بەگوێرەی سافی مینای خۆی
لە دیـنی ئـیسلام پـڕتـەوی دێ بۆی
ئـــەمە دەرئـــەخابە لەفـــز و مــەعنا
فــەرمودەی حــەزرەت «سَـلْمَانُ مِـنَّا»
مـــیزانـــی ئـــیسلام بـۆ بـەنی‌ئادەم
ئـەتقا ئـەشرەفە و ئـەعلایە و ئـەکرەم
«اَتـقیٰ» شـەخسێکـی زیادە تـەقوایە
تـــەقوا پـــارێزی حـــەدی خـودایـە
بــە کـوردی مـانای فـەرمان‌بەرداری
لەبـــۆ دەســتووری حــەزرەتی بـاری
وا دەرکــەوت لەبـۆت ڕیسالەتی عـام
«عَــــمَّنَا اللهُ بِـــنُورِ الإِسْـــلاَم»

* * *

---

١. ڕەگەزپەرست و ڕەگەزخواز.

# ئایا ڕەهبەران بە زۆر ئایینیان بەسەر خەڵکدا سەپاندووە؟

**پرسیاری یازدەهەم:**

مامۆستای دەرزی دین و ئایینم | مایەی ئاسایش بۆ ماوەی ژینم
باسێ هاتووە لەلای بێگانە | بۆ چاوی دڵم بووە بە تانە
ئەڵێن پێویستە گەلی ڕەهبەران... | نەبن بە مایەی ڕەنجی هاوسەران
وەزیفەی ڕەهبەر ئامۆژگارییە | نەك شێر و تیری هۆی بێزارییە

**وەڵام:**

شاگردی مەردم، بە عەقڵی زانا...
ئەتوانیت بژی لە ڕووی جیهانا
ئاگات لە خۆتە ئێرە لاپێیە
چەن پلەی سەخت و لارت لە ڕێیە
دووربە لە بیرێ بتخاتە ناو بیر
بێرە ژێر سایەی تەفکیر و تەدبیر
یەکەمجار ئەڵێم: مێژووی ڕۆژگار
کە باش ئەیزانێ مەردی خەبەردار
تەماشای بکە بزانە ڕەهبەر
چەنێ بێزار بوو لە جەفای بەشەر
بزانە چۆن بوو خولق و ئادابی
ئیدارەی لەگەڵ ئال و ئەسحابی

چـــۆن بـــوو ئـیدارەی بـۆ ئـادەمیزاد
بــۆ بـانگ‌کردنیان بـۆ ڕێگـەی ڕەشـاد
بـە تـاریخی سـاغ حـەزرەتی ڕەهـبەر
لە چـاڵ سـاڵیـدا بـوو بـە پـێغـەمبەر
لەپـاش ڕیسـالەت تـا سـیازدە سـاڵ
لە مـەککـەدا بـوو بـە عـەقڵ و کـەماڵ
عـــادەتی وابـــوو بـــە مـــیهرەبانی
خـەڵکی بانگ ئـەکرد بۆ موسوڵمـانی
بـانگی ئـەکردن بـە شـێوەی حـیکمەت
بۆ سـەر شـاڕێگـەی ئیقباڵ و ڕەحـمەت
بـۆ تـەوحیدی حـەق خـەللاقی عـەللام
بۆ خـولقی بـەرز و بۆ سیلەی ئـەڕحـام
هـەرچـەن بـۆی ئـەهات ئـازاری تـانە
قـەت لای نـەئەدا لەم شـێوە جـوانـە
بـەڵکـوو مـوقابیل، بـە غـەدری ئەوان
دۆعـای خـێری بـوو بـەرابـەر بـەوان
لەم مـاوەی سـەختا گـەلێ لە ئـینسان
ڕوویـان کـرد لە حـەق بـە وەعـز و بـەیان
ئـەمجار لە تـرسی شـەڕی خـوو پـەستان
لە مـەککـە دەرچـوون بۆ حـەبەشستان
پـاشای حـەبەشە چونکی شـەریف بـوو
مـەشرەبی بـەرز و قـەلبی نـەزیف بـوو

ئــیکرامــی گــرتن بــە دڵ و بــە گــیان
ئــەوانــیش هــەموو بــە خــۆشــی ئــەژیان
لەپـــاش مـــاوەیێ هـــاتنەوە حـــیجاز
لەبـــۆ حــوزووری مــەولای ســەرفەراز
جا چوون کافران تـالیب بـوون بـە غـەش
تــیکرار چــوونەوە بـۆ مـوڵکـی حـەبەش
لەم بـەینا گـەلێ دەشـتەکـی ئـەعراب
بە ئیرشادی دیـن، بـە «نصّ»ی کـیتاب
بــە ئـامۆژگـاری، بــە نــەرمی و ئـارام
شــەرەفیان وەرگــرت بــە دیـنی ئـیسلام
قــەبیلەی «غِـفار» هــەم «بـنی اشـهَل»
هــاتنە ســەر دیـنی ڕەسـوولی ئـەکـمەل
بـــە نـــامە نـــووسین ئــەهالی یــەمان
دڵیــان ڕوونــاك بـوو بــە نـووری ئـیمان
حەزرەت خۆی «بِالذّات» تەشریفی ئەبرد
لە قـــەبایلا ئـــیرشـــادی ئـــەکـــرد
بـــانگی ئــەکــردن بـۆ دیـنی ئـیسلام
بـۆ ڕەوشـتی بـاش ئـیحسان و ئیکرام
سێ ساڵ لەسەر یەك لە «موسم»[١] حـەج
چووە لای حەججاج لە «أوس و خَـزرَج»

١. کات، وەرز.

گـەلێ لەمـانە بـە حـەق ئیسلام بـوون
تـابیعی دیـنی «خـیر الأنـام» بـوون
تـەعەهھودیان کـرد بـۆ «خـیر الأنـام»
یـارمەتی بـدەن بـۆ نـەشری ئـیسلام

❊ ❊ ❊

کـە ئاگـادار بـوون کـوففاری مـەککـە
نەجاحی حەزرەت بێ شوبهە و شەککە
گشت گـرد بـوونەوە لە «دار النّـدوة»
بـۆ ئـیمحای زاتـی خـاوەن «نـبوّة»
جا بـە ئـەمری خـوا ئـەو شـای ئـەمینە
هـیجرەتی فـەرموو لەبـۆ مـەدینە
ئـیستیقباڵیـان کـرد یـارانـی «انـصار»
هـەتا دامـەزرا سـەییدی ئـەبرار
هـەتا یـارانـی لێی گـرد بـوونەوە
بـە نـووری لیـقای دڵ شـاد بـوونەوە
ئـەمجارە هـەموو بـە لوتـف و نـەرمی
کـەوتنە ئـیرشـاد زۆر بـە دڵگـەرمی
لەسـەر ئـوسوولی ئـایینی ئـیسلام
لەگـەڵ «کِـتابی» ئـەژیان بـە ئـیکرام
نیسبەت بە ئـەهلی تـەورات و ئـینجیل
ڕەوشـتی بـاش بـوو سـەییدی جـەلیل

«بالعکس» گەلی بەنی ئیسرائیل
لەو دەوروپشتا کەوتنە «تضلیل»
«بعضاً» بە جیدال، «بعضاً» بە شیقاق
«بعضاً» بە حیلە و سیاسە و نیفاق
بە شەو و بە ڕۆژ بەبێ داماوی
بۆ موسوڵمانان شێریان ئەساوی
بە موخابەرەی کوففاری حیجاز
بە موئامەرە لە شای سەرفەراز
کوففاری مەککەیش بە یاری ئەوان
قوسووریان نەکرد بەگوێرەی ئیمکان
جا کە مەعلووم بوو نەرمی بێ سوودە
بێدادی دوژمن زەمان ئەفزوودە
موشریکەکان و جوولەکەی حیجاز
ئامادەن لەبۆ تەخریب و ئیعجاز
بەم حاڵەیش ئیسلام ناگا بە پایە
هەر سەعیێ بکەن ئەڕوا بە زایە
بە ئەمری خودا یاسایان گۆڕا
ئەمری جیهاد و شەڕیان پێ درا

* * *

لەبەر حورمەتی تەورات و ئینجیل
سێ خەسڵەت لەگەڵ بەنی ئیسرائیل

یــــەکــەم: قــەبووڵی ئــایینی ئـیسلام
دووەمــین: جـیزیە و ئـیتاعەی ئـەحکام
سـێهـەمین: دیـفاع بـە چـەك و سـیلاح
ئەونە پێویست بێ بـۆ غـایەی ئـیسڵاح
بــەڵام مــوشریکین لە ئــەهلی حـیجاز
هــەر دوو خــەسڵەتـیان بـۆ کـرا ئـیبراز
یــا قــەبووڵی دیــن بــەبێ فـێڵ و گـەڕ
یـاخود حـازر بـن لەبـۆ حـەرب و شـەڕ
هــــەتا ئــەوانـیش نـەهاتنە مـەیدان
بــــە نـائینسانی، بـە کـیبر و تــوغیان
حەزرەتی ڕەسوول بـە حـوسنی تـەدبیر
دەسـتی خـۆی نـەبرد لەبـۆ شـێر و تـیر
هـــەرشتێ بــووبێ لە غــەیری ئــەمە
نـــاچاری بـــووە لەو کـــات و دەمــە
بــەڵێ، کـە دوژمــن کــەوتە نـامەردی
کـەوتە مـەیدانـی غـەدر و دڵ سـەردی
بــۆ ئـەهلی شـەرەف شـەرەف نـامێنـێ
هــەتا خــوێنـی سـوور لەویـا نـەڕژێنـێ
یــەکـێ بـڕوانـێ لە پــەڕەی مـێژوو
ئــەم حــەقیقەتەی بــۆ دەرئــەچێ زوو
ئــیتر بـا دوژمــن بـێتــە تـەك و دەو
سەگ هەر ئەوەڕێ لە ڕووی مانگەشەو

یەکێ بە نەرمی چاری نەکرێ
ناچار دەمی تێغ ئەبێ دەس بگرێ

❊ ❊ ❊

عەلاوە ئینسان بڕوانێ جوان
بۆی دەرئەکەوێ دوو بەشە ئینسان
بەشێکی..............................
........................................................ ١

پێویستی نییە بە ڕەنج و زەحمەت
خۆی ئامادەیە بۆ فەیزی ڕەحمەت
کاتێ کە بیستی ئیرشادی ڕەهبەر
لەسەرئەمری ئەو ڕێ ئەگرێتە بەر
بەشی دووهەمیان هۆشی نەخۆشە
لە وەرگرتنی تەمێ بێ هۆشە
گەلێ موحتاجە بە ئامۆژگاری
تا ڕزگار ئەبێ لە هۆی بیماری
لێرا پێویستە موعجیزەی ڕەهبەر
تەمێ و تەربیەش بە سوودە و سەمەر
لەم بەشا هەیە بەشێکی نابار
سوورەت ئادەمی، سیرەت گورگی هار

١. بەداخەوە لە نوسخەکەی بەردەستی ئێمە بەهۆی لەناوچوون و درانی لای خوارووی ئەم لاپەرەیە، ئەم بەیتەمان بۆ ساغ نەکرایەوە، ئەگەر کەسێك نوسخەیەکی تری لەلایە ئاگادارمان بکاتەوە تا لە چاپەکانی داهاتوودا بتوانین کەڵکی لێوەرگین.

ئـــەم نـــەوعە کـەسە لە سـەرووی عـالەم
لە ڕۆژێکـــــەوە هـــــاتووە ئـــــادەم
تـــــا ئـــــەبڕێتـــەوە دەورەی بـــەشەری
کـــار نـــاکـــا لێیـــان تـەمێ و ڕەهـبەری
ســـەد سـالْ بـە چـاکـە خـزمەتی بکـەی
بـــە واتـــەی ڕوونـــاك تـــەمێی دابـدەی
**«كَأَنْ لَـــمْ يَـــعْلَمْ حُكْـــماً مَـــذْكُـوراً**
**كَأَنْ لَـــمْ يَـــفْهَمْ نَـــظْماً مَسْـــطُوراً»**
هـــــەر دەقـــیقەیێ فـــرسەتی هـــێنـــا
شـــــەڕ ئـــــەنێتـــەوە لە ڕووی جـــیهانا
تـــۆخـــوا ئـــینسانێ ڕەوشـــتی وا بـــێ
دوژمـــنی حـــەق و دۆســـتی هـــەوا بـــێ
بـــێجگـــە لە نـــەمان چـــییە تـــەدبیری
تـــەمێی چـــی ئـــەکـا، چـییە تـەئسیری

* * *

عـەلاوە ئەهلی ئەم تیر و تـانە / یـانێ نـووسەری گـەلی بێگـانە
ئەگەر کیتابین، کیتاب حـەکـەمە / تەبعەن بە کیتاب خاتریان جـەمە
ئەگەرنا فەرموون لاپەڕەی مێژوو / تـیایا نـووسراوە کـارەساتی زوو
دیـارە فـەجری تـاریخی جـەلیل / ئـەزانـن حـالْی بـەنیئیسڕائـیل
دیارە جەنگی «یوشع»ی جـەلیل / مەردی کۆمەڵی بەنی ئـیسڕائـیل
دیارە لەلایان هەموو بەن بە بـەن / کارەساتەکان لای نەهری «اردن»
دیارە حـەرب و دیـفاعی «داود» / دیارە قەتلی «جالوت»ی مەردوود

دیارە ئیدارەی نەبی «سُلیمان» نامەی بۆ بەڵقیس مەلەکەی یەمان
ئەگەر بەدخواهان نەدەبوون لەویا بۆشەڕیانئەکردلەسەرڕوویدونیا؟!

* * *

بەڵێ حەزرەتی عیسای «بن مریم» ئەمری پێ نەبوو بۆ حەربی «اُمَم»
بۆیە تایفەی بەنی ئیسرائیل دەورەیان لێدا بە زەرب و تەنکیل
ویستیان بە ساغی بیکەن بە دارا دینێ نەیێڵن لە دێ و لە شارا
بەڵام خوداوەند ئەوی ڕزگار کرد یەکێ لەوانی بە دارا هەڵکرد
خودا مەسیحی برد بۆ ئاسمان پاراستیلەدەستجوولەکەیزەمان
«مَــعَ أَنَّــهُ» ئەتباعی ئەمان بڵاو بوونەوە لە ترسی گیان
«هۆڕین» شاهیدە لە کوردستانا ئەیگێڕنەوە لە داستانا
«حَواریون»ە ئەسڵی ئەم ناوە بە زمانی کوردی «هۆڕێن» وتراوە
پاش ئەوە عیسا لە ناوا دەرچوو «انجیل» لەو ناوا فەوتا زووبەزوو
ئەم چوار ئینجیلە ئێستە دیارن ئینشای چوارکەسی زانای بە کارن
«مارقس» و «لوقا» و «متی» و «یوحنا» یەك لە دوای یەك لە ڕووی زەمانا
هەریەکێ بۆخۆی نووسی ئینجیلێ لەبۆ گەلی خۆی بوو بە دەلیلێ
هەموو تاریخ و ئەحواڵی عیسان نەوەك ئینجیلی سەماوی ئەوسان
ئیعتیراف ئەکەن گەلی «نصاریٰ» ئینجیلی عیسا زوو لەناو برا
ئیتر بێن بڵێن بزانین کام دین هەربەنەسێحەتکەوتەسەرزەمین

* * *

ئەمجار بێنە لای خوێندەوارەکان
کە لەسەر ئیسلام ئەکەونە تەکان

بکەین بە حەکەم ویجدان و ئینساف
لادەیـن لە ڕێگەی عەناد و خیلاف
ئەگەر شێر و تیر مایەی خەتایە
ئەغلەب کارخانەی لە «ئەوروپا»یە
خۆیان ئەزانن خاکی ئەوروپا
قەت خاڵی نەبووە لە جەنگ و غەوغا
جەنگی وا بووە لە سەد ساڵ زیاد
هۆی فەنا بووە بۆ ئادەمیزاد
هەر لەسەر هەوا و ئارەزووی چەن کەس
بەبێ غایەیێ پاك و موقەددەس
ئەوەندە لەسەر «هُدنە»یان[1] ماون
کە جارێکی تر شمشێر بساون
بێجگە لە جەنگی سیاسی خۆیان
کە پەڕەی مێژوو بۆت ئەکا بەیان
بێن تەماشا کەن جەنگی «صلیبی»
بە قەساوەتۆ جەفای عەجیبی
پاشا و قەشەکان بە بەهانەی دین
ئەهاتن بۆ جەنگ لەبۆ «فلسطین»
بە خوێن ڕێژانی میللەتی ئیسلام
بوو بە گوڕستان خاکی «مِصر» و «شام»

١. ڕاوەستان و ڕاگرتنی شەڕ.

بۆمان دەرئەخا مێژووی سەرزەمین
دەورەی «نورالدّین» تا «صلاح الدّین»
کە چەن بە مەردی هاتنە مەیدان
بە نوور نووسییان تاریخی مەردان
ئەگەر بەهانەی ئیسڵاح ئێتە بەین
هەردوو تەرەفمان ئیددیعای ئەکەین
ئەگەر مەبەستان ئیستیلای خاکە
چوون خۆتان وانە بێدەنگ بن چاکە
مەدەن لە ئیسلام تانە بە بوختان
کەمێ بڕوانن بۆ حاڵی خۆتان
لاپەڕەی مێژوو بە حەق ناتیقە
بۆت بەیان ئەکەن ئەم حەقایقە
کە عەقڵ و نەقڵی تاریخ هاتە ناو
مەجال نامێنێ بۆ درۆی داماو

* * *

# بۆچی ئایینی ئیسلام ئاخرین بەرنامەی خودایە؟

**پرسیاری دوازدەهەم:**

سەرچاوەی بیر و باوەڕی چاکم
مامۆسای زانای دەروون ڕووناکم
حیکمەتی چییە پاش دینی ئیسلام
دینیٚ‌تر نابیٚ لەسەر ڕووی ئەییام
«تَطَوُّر»[1] بووە بۆ بەنی ئادەم
لە ئادەمەوە تا چەرخی خاتەم
هەروەها ئەڕوا گۆڕانی ئەخلاق
بە گوێرەی وەزعی پێویستی ئافاق
مانیع کامەیە چەن دینیٚ وابیٚ
لەسەر «اقتِضا»ی وەزعی دونیا بیٚ
بۆم بەیان بکە دەلیلێکی وا
دڵم ڕزگار بیٚ لە تۆزی هەوا

**وەڵام:**

ڕۆڵەم، فەرزەندم بەندی جگەرم
ڕووناکی دڵ و نووری بەسەرم
دین بۆیە باشە بۆ ئادەمیزاد
بە سوود بیٚ لەبۆ مەعاش و مەعاد

---

١. گۆڕان، گەشە کردن.

هـۆی ژیـانی بـێ بـێ‌ترسی گیان
بـــە ئـاسوودەیی تـا وا لە جـیهان
مایەی سـەربەرزی ڕۆژی جـەزا بـێ
پـایەی پـیرۆزی و مـایەی ڕەزا بـێ
ئایینی ئیسلام لەسەر مەعنای خۆی
کەس چاتر لەوە ڕێك ناکەوێ بـۆی
ئـــیتر بـــۆچـــیتە ئـــایینێ تـازە
نــەگـا بــە پایەی ئـەو سـەرفەرازە
جـا دڵ ڕابگـرە تـا بـۆت بـەیانکەم
حـیکمەتی واقـیع بـۆتـۆ عـەیانکەم

❊ ❊ ❊

لەسـەر سـێ بـەشە ئـەحواڵی بـەشەر
لەمـــە دەرنـــاچێ بـــە بـیر و بـاوەڕ
یـەکـەم: حـاڵی ئـەو لەگـەڵ خـودادا
کــە ئــەوی هــێنا بـە ڕووی دونـیادا
دووهەم: حاڵی ئەو بۆ وەزعی نەفسی
بـە نــەوعێ بگـا بـە پایەی قـودسی
سـێهـەم: ئــەحواڵی لەگـەڵ بـەشەرا
لەگــەورە و بــچووك بـێگــانە و بـرا
یــاسای ئـــەمانە هــەیە لەم دونــیا
ئـــەژی لەگـــەڵتـا لە مـاوەی ژیـنا

بــە نــەوعێ بــڕوا لەگــەڵ «تَــطوُّر»
بــەڵام بــە ئــەدەب نــەك بــە «تَــهوُّر»[1]
ڕێگــەی ئــیجتیهاد لەبــۆ زانــای بــەرز
کــوێر نــابێتــەوە لەســەر پــانی عــەرز
پــێت نــیشان ئــەدا ئــەمەی کــە وتــمان
کــردەوەی مــەردان بــە تــوولی زەمــان
ئــەوەی نــەگــۆڕێ بــەس مــوهیمماتە
کـــە ڕاگـــرتنیان فـــەرزی حــەیاتە
وەکوو ئــەسڵی دیــن، ئــەرکانی ئــیمان
ئادابــی ئــیسلام لەســەر ڕووی جــیهان
پــاراســتنی گــیان، پاراستنی هــۆش
پارێزی نامووس لە شەخسی نەخۆش
پــاراســتنی مــاڵ بــە یــاسای ئــیسلام
بە نەوعێ نــەبێ بــە مــەینەت بــۆ عــام
غــەیری ئــەمانە هــەرچــی ڕێکــەوێ
ئــیسلام لە چــاری پــەکــی نــاکــەوێ
ئــیسلام بــە نــەوعێ ڕێگــای گــوشادە
هــەرکەس پــیا بــڕوا شــاد و ئــازادە

❊ ❊ ❊

عـــــەلاوەی ئـــــەمە لە زەمـــانی زوو
ئــەم عــیلمەی ئــیمڕۆ کــەی لە نــاوا بــوو

١. هەڵەشەیی و پەلەکردن.

هــۆی پـەیکی ئیعلان یـەك لە هـەزار بـوو
ڕێگـــەی ڕێڕەوان ســـاراو کـۆسـار بـوو
ڕەهــبەرانــی پــاك لە بــەشەر دوور بـوون
هەرکام لە شوێنێ مات و «محصور»[1] بوون
بە ماوەی چەن ساڵ پاش مـەرگی ڕەهـبەر
لەبـــۆ دیـــنەکـــەی نـــەدەما خـــەبەر
نـــاچار بـــوو بـــەشەر لەبـۆ دیـنی نـۆ
هـــەتا بـــەشێکـیش ڕێکـەوێ بـۆ تـۆ
خـــودا زانـــا بـــووکــە دیـنی ئـیسلام
هــاوڕێی گـۆڕانــە بـۆ چــەرخـی ئـەییام
زانســـتی جـــیهان زۆر ســـەرئەکـەوێ
پـیشە و فـەننی بـەرز زۆر دەرئـەکـەوێ
دیـــنێکـــی وای نـــارد بـــۆ ئـادەمیزاد
بـــۆ پـــیرۆزیـــیان بـــبێ بـــە بـــونیاد
ئـــــەسڵی ڕابگـــرن بـــەبێ «تـــهوّر»
لە ژیـــــنا بـــــڕۆن لەگـــەڵ «تـــطوّر»

❊ ❊ ❊

واتـــەیێ هـــەیە ڕایبگـره بـــە دڵ
«تـطوّر» بـۆ دیـن نـابێ بـە مـوشکڵ
حــەقیقەت وێنـەی نـووری هـەتاوە
بـــەکــارە هــەتا ئــەم دونـیا مــاوە

---

١. واتە: دەورەدراو تایبەت کراو.

عــەداڵەت وێنــەی کــورەی زەویــیە
پێویستی شــوێنــی بــەرزی و نــەوییە
عــەقڵ بــەوێنــەی ڕوونــاکــی چــاوە
پــێویــســتی تــۆیــە تــا عــومرت مــاوە
نامووس بۆ بــەشــەر هــۆی کــەڕامــەتە
ڕوکـــــنی ژیـــانە و زۆر بـــە قــیمەتە
ئـــــازادی بـــەشــەر لە حـــاڵ و مـــاڵا
شان بــە شــان ئــەڕوا لەگــەڵ کــەماڵا
سوجدەی بەندەگی، ڕیازەی نەفسی
پــێویــســتی تــۆیــە بــۆ ژیــنی قــودسی
ئــینسان لە حـــەیوان زۆر جــیاوازە
ئــەم ئــارام ئــەڕوا و ئــەو بــە جــانبازە
دین ئینسان ئەکــا بــە ئــینسانی بــەرز
ناهێڵێ ببێ بە وەحشــی ســەر عــەرز
ئــەم حـــەقایقە قـــەت کـــۆنــە نـــابن
فەرزە بۆت هەرچەن لە ســەمادا بــن

❊ ❊ ❊

# دین پێوستە

دیـن قـووتی ڕۆحـە وەکـوو نـان و ئـاو
دیـن بـۆ ژیـنـی تـۆ ئـەبێ بـە هـەتاو
بێ هــەتاوی ڕۆژ ســەمەر پێ نــاگـا
بـەبێ تـاوی دیـن بـەشەر تێ نـاگـا
چ ئـــینسانێکـــە بـــاوەڕی وا بـــێ
لە تــۆڵەی غــەدراجــەزایێ نـابێ
چ ئـــینسانێکـــە ئـــینسان بکـــوژێ
بـەوێنـەی هـەنار خـوێنی هـەڵمژێ
چ ئـــینسانێکـە بـە هـەوا و تـوغیان
جــیهان لە ئـینسان بکـا بـە زیـندان
چ ئـــینسانێکـە وەێنـەی کـەوە مـار
پـــەلامار بـــدا بـــۆ گـــیانی هـەژار
چ ئـــینسانێکـە بـە پـەستی نـفووس
هـێرش بـباتە سـەر مـاڵ و نـامووس
حـــەقیقەتی دیـــن وێنـەی قـەڵایـە
ئـــینسانی بێ دیـن دەرد و بـەڵایـە
بـۆ عـالەم دەرکـەوت لەسـەر بـەراورد
هەر حەق بوو ژیا و هەر ناحەق بوو مرد

ڕۆحـی دیـن حـەقە لەم ڕووی دونـیایە
مـــایەی «خــلود»ە، هـــەتا هــەتایە
وردە پـــێویســـتت لەســـەر ئـیجتیهاد
دیـــن مــــەنعی نـــاکـا لە ئـادەمیزاد

❊ ❊ ❊

ئـــەو مـوهیمماتە ئـیشارەم بـۆکـرد
بۆت بـەیان ئـەکـەم بۆی بـڕوانـە ورد
ئـیسلام لەبـۆ تـۆ ئـەبێ بـە ڕەهـبەر
بـــۆ شـتی بـەسوود لە بـیر و بـاوەڕ
ئـــەڵێ پـــێویســــتە بـــاوەڕت بـبێ
کـــە پــــەروەردگار بـۆ دونـیا هــەبێ
خاوەن کـەماڵ بـێ و لە نـوقسان بـەری
بـە مــەعنایی عــام بـێ دەردیسـەری
ئـــەبێ ئـــایینێ بـــبێ بـــۆ عـــالەم
ڕێ نـــیشان بـــدا بـــە بـــەنیئادەم
واســـیتەی ئـــەمە فـریشتەی ئـەمین
«کُـتُب»ی هـێنـا لەبـۆ مـوڕسـەلین
لەم کــــــتێبــــــانا بـــەیان کـــراوە
لەســــەر کـــردەوە جــــەزا دانــــراوە
هـــەتا ڕۆژێ ئـــێت، یـانێ قـیامەت
جــەزا وەرئــەگرن ئـەفرادی ئـوممەت

باوەڕت وابێ خالیقی دونیا
خالیقە لەبۆ جەمیعی ئەشیا
هەرچی ئەو ئەیکا خاوەن حیکمەتە
ئەگەرچی دەرکی حیکمەت زەحمەتە
باوەڕ بە خوا و فریشتە و ڕەهبەر
بەکتێب، بە جەزا، بە قەزا و قەدەر
ئوسولن، یانێ بناغەی ئایین
پێویستە لەسەر گشت موکەللیفین
لە موهیمماتە بۆ هەموو ئوممەت
کە تەوانای بوو ئەدای شەهادەت
شەهادەت وێنەی دەفتەری نفووس
ئیسلام دەرئەخا بۆ تۆ بە خوسووس
ئەمجار پێنج فەرزە کە ناوی نوێژە
دوویان بۆ شەوە و سێیان بۆ ڕۆژە
ئەمجارە ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان
لە گشت ساڵێکا لە ماوەی ژیان
جا زەکاتی ماڵ بۆ موسوڵمانان
وا ناو براون بە نەسسی قورئان
ئەمجارە حەججی «بیت الله»ی ئەکرەم
لە شاری مەککە، کەعبەی «مُعَظَّم»
لە عومرا جارێ بە شەرتی ئیمکان
لەسەر دەستووری خودای لامەکان

لە مـــــــوهیمماتە دووری لە تـــاوان

ئـــەوەی زیـــانە بـــۆ مـاوەی ژیـان

بـــۆ پـاراسـتنی دیـن و گـیان و مـاڵ

بـــۆ پـــاراسـتنی نـاموس و کـەماڵ

ئـەمانە هـــەموو دەسـتووری «عـــام»ن

خـــاوەنەکـانیان بـە حـەق ئـارامـن

هـــەرکەس تـــێبگـــا لەم لاپـــەڕانـــە

بـــاوەڕی ئـــەبێ بـــەم بـــاوەڕانـــە

* * *

# حیکمەتی هەندێ لە ئادابی دین

چا بە قەی ئیمکان حیکمەتەکەیان
بە کورتی و سافی بۆت ئەکەم بەیان
بەو باوەڕانە دڵ ڕووناک ئەبێ
وێڵی کردەوە و خولقی چاک ئەبێ
چونکی کردەوە بارەی باوەڕە
خاوەن بیری پاک زۆر دوور لە شەڕە
بیرێ ڕووناک بێ ئاوەکەی سافە
کەشتی ئاوی صاف خاوەن شەفافە
باوەڕێ باش بێ دوو بارەی[1] تیایە
یەکەم: بەندەیی زاتی خودایە
دووهەم: دڵسۆزی بۆ ئادەمیزاد
تا هەموو بژین ئازاد و دڵشاد

❊ ❊ ❊

بە «شهادَتَین» خۆت پیشان ئەدەی
بیرو باوەڕی خۆت ئیعلان ئەکەی
موقەددیمەی نوێژ هۆی «نظافت»ە
مایەی دوورکەوتن لە کەسافەتە

١. کەڵك، سوود.

ئینسان سبەینێ کە هەستا لە خەو
وا بە لەشیەوە چڵکی کاتی شەو
ئایین پێت ئەڵێ لەشت بشۆری
لە پیسی و پەستی وەزعت بگۆڕی
ئەمجارە عەرزی بەندەگی بکەی
بە دوو ڕکات نوێژ خۆت نیشان بدەی

* * *

پاش هەتاو کەوتن هەتا نیوەڕۆ
ئینسان مەشغوولە بە هۆی ژینی خۆ
لەش، بەخسووس ڕوخسار، هەموو دەست و پێ
چڵك و عارەقی لێ پەیدا ئەبێ
عەلاوە کاتی سەرفی تەعامە
کاتی ڕیعایەی پاکی ئەندامە
کاتی تاعەتی زاتی خودایە
کە تەوفێقی دای پایە بە پایە
لەم نیوەڕۆژا تاعەت و پاکی
ئەبێ بە مایە بۆ دڵ ڕوونــاکی

* * *

عەسر مەوسیمە بۆ ئیستیراحەت
بۆ ڕابواردن لەگەڵ جەماعەت
لێرا «نظافت» چاکە بۆ بەشەر
هەتا گیرۆدە نەبن بە زەرەر
کاتی شێوانیش کاتی تەعامە
پێویستی ئینسان پاکی ئەندامە
بێجگە لە خۆراك کاتی تاعەتە
تاعەت بە پاکی هۆی سەعادەتە

* * *

عـــیشا کـــاتێکـــە ئـینسان ئـەنوێ
حـەواس لە پاسی بـەدەن ئـەکـەوێ
لەم بـێ‌هـۆشـییا نـایەوێ ئـیسبات
ئینسان تووش ئەبێ بە «مُستقذِرات»[1]
بۆ یەکێ ساغی و سیحەتی بوێ
پـــێویســـتە لەگـەڵ پـاکـییا بـنوێ

❊ ❊ ❊

حیکمەتی غوسڵی جەمیعی ئـەندام
لەپاش جـەنابەت لە دیـنی ئـیسلام
ئـەمەیە ئـینزال کـاتێ هـاتە جـێ
بۆ هەموو «مَسامّ»[2] تـەئسیری ئـەبێ
بـــۆ کـــردنەوەی ئـەو مـەسامانە
خـۆ شـورین مـایەی سـاغی گـیانە
بۆیە دوکتۆران لەسـەر خـاس و عـام
بـڕیـاریان داوە شـۆریـنی ئـەندام
هـۆی گـردەوەبوون لەبـۆ نـوێژەکـان
ئـــولفەتی دڵە بـــۆ هـاودینەکـان

[3]..............................................

تـایبەتی جـومعە گـەورەی ڕۆژانـە
هـۆی یـەکگـرتنی مـوسڵمـانانە

---

١. گەندەڵی و پۆخڵاوات. ٢. کونە وردیلەکانی لەشی مرۆڤ.
٣. لێرەدا بەیتێك هەیە و لە دەسخەتەکەدا تەواو روون نیە.

تـا پـێشـەوایـان جێداری ڕەهبەر
سەرکەون بۆ سەر مەقامی مینبەر
بە موناسبی چەرخی ڕووی زەمان
ئاگادار بکەن گشت موسوڵمانان
بە دوو خوتبەی بەرزکۆرت و پڕ مەعنا
خەبەرداریان کەن بۆ دین و دونیا
ئەوەی پێویستە بۆ ژینی «مؤمِن»
ئەوەی چارەیە بۆ کینەی دوژمن

❁ ❁ ❁

جا بێنە سەیری ئەم گرد بوونەوە
لەگەڵ تەربیەی ڕەهنموونەوە
ڕۆژێ پێنج دەفعە زۆر بن یاخۆ کەم
حەفتەیێ جارێ هەموو بە سەر جەم
وەربگرن دەرس و تەربیەی ئیسلام
نەزان نامێنێ لەسەر ڕووی ئەییام
بێجگە لە بارەی پیرۆزی بۆ دڵ
بێجگە لە چارەی هەزاران موشکڵ
بێجگە بەخششی خودای عالەمین
بۆ دڵ و گیانی گەلی موسلیمین
کە نوێژ مێعراجە بۆ دڵی ئاگا
بەرز ئەبێتەوە بۆ فەیزی خودا

ئەبێ بە حەسار لە فەحش و مونکەر
لائـــەبا لە دڵ خـــەساری خـــەتەر

❊ ❊ ❊

بـێنـە تـەماشای حـێکـمەتی ڕۆژوو
پـایەیە لەبـۆ بـەرزی خـولق و خـوو
ڕۆژوو دوژمـــنە بـۆ نـەفس و هــەوا
نـەفس ڕام ئـەکـا بۆ حـوکمی خـودا
ڕۆژوو هات و چووی شەیتان ئـەبڕێ
بـۆ دڵی ئـەوەی کـە ڕۆژوو ئـەگـرێ
ڕۆژوو دەروونت پـــاك ئـــەکـاتەوە
لەو خـــولقە پـیسە وابـــەلاتەوە
ڕۆژووە دڵت نـــوورانـــی ئـــەکـا
وێنـــەی فـــریشتە لەنـاو فـەلەکـا
ڕۆژووە وێنـــەی مـەکـینەی بـەتاو
دڵ ئـێنـێتـە جـۆش بـە وێنـەی هـەتاو
ڕۆژووە مـــایەی ئـــارامـــی تـۆیـە
لەو پـــــەلەپەلە بــە نـــەفسەوەیە
ڕۆژوو ئـینسانی پـێ ئـەبێ بـە مـەرد
خۆی پێ ئەگـیرێ کـاتی ئـێش و دەرد
ڕۆژوو لائـــــەبا ئـــەو دەردودایـــە
لە نـــاو مـــەعیدەی ئـــادەمیدایـــە

بە ڕۆژووی بە حەق ئەبی خەبەردار
لەسەر ئەحواڵی ئینسانی هەژار
مەتەڵێ هەیە وەك واتەی قودسی...
تێر ئاگای نییە لە حاڵی برسی
ئەمەیە هەندێ حیکمەتی ڕۆژوو
لای خۆت ڕای بگرە بە وێنەی مێژوو
بۆیە واجب بوو ڕۆژوو بۆ عالەم
پاش دەوری ئادەم تا عەهدی خاتەم

❊ ❊ ❊

ئەتۆ بڕوانە بۆ جەژنی شادی   بڕوانە فەیزی گەردن‌ئازادی
هەزار دوژمنی دڵ پڕ لە کینە   پاك ئەبێتەوە بە سەفای سینە
چونکی لە کاتی دەست کردنە مل   ڕەحمەتی خودا ئەبارێ بۆ کول

❊ ❊ ❊

حیکمەتی زەکات بە دینی ئیسلام
یارمەتی دانە بە یاسایێ عام
خودا ئەیەوێ ئینسان خاوێن بێ
بۆ سوودی ئیسلام وێنەی هەوێن بێ
بە هەموو نەوعێ داوای لێ ئەکا
حەقی بەندەگی بۆ ئەدا بکا
بە سوجدە بردن بە هۆی نوێژەکان
بە ڕیازەتی ڕۆژووی ڕەمەزان

بــە بـــەخشینی مـــاڵ لەبــۆ هــەژاران
بـــــۆ دامـــاوانــــی ڕووی ڕۆژگـــاران
خــــودا نـــایەوێ ئـینسان «لَـئیم»[1] بـێ
ئـەیەوێ بـە حـەق مـەرد و کـەریم بێ
چ ویـــجدانـــێکـــە ئـینسان دابگـرێ
ئــــەو بــــژی و بـــرای لە بــرسا بـمرێ
پــــەستی تـــەبیعەت بــۆ حــەیوانـانە
دوورە لە خــــولقی ئــــەوەی ئـینسانە
یـەکـێ دەس بـبا هــەر بۆ دەمـی خـۆی
مـــەعنای ئـینسانی ڕێنـاکـەوێ بـۆی
هەرکەس لە هەژار دەرگای خانووی بەست
قـاپی ڕەحـمەتی لەسـەر خـۆی داخست
شــەرەف ئـیخلاسە و کـەرامـەت کـەرەم
شــــەرەف و کـــــەرەم فــەرزن بــۆ ئـادەم
مــادام تـــۆ لەگـەڵ بـراتـا بـاش بـی
لەبـۆ سـوودی ئـەو خـاوەن تـەلاش بـی
خـودایش قـاپی خـۆی ئـەکـاتەوە لێت
دە قـــات لە خــێرات ئـەداتــەوە پـێت
بـــە یـــەك دڵ ئـەژین لەگـەڵ بـراکـان
لە ڕۆژی ڕەشـــا نـــاکـــەونە تـــەکـان

---

١. رژد، چرووك.

بـــوویه ئـــایینی ئـــیسلام بـۆ نـــەجات
فـــەرزی فـــەرمووه فـــەریزەی زەکـات
پێنج یەك و دەیەك، بیست یەك و چل یەك
ڕوکـنی ئـیسلامه بـەبێ شـوبهه و شـەك
لە قـوتا «دەیـەك» یـا «بـیست یەك» فـەرزه
لەبـۆ مـوسوڵمان هـۆی خۆشـی عـەرزه
لە مـــاڵی نـــەختا و جـینسی تـیجارەت
«چـــل یەك» واجـــبه بـەبێ خـەسارەت
ئـەگـەر فـەرماندار بـاش بـەجێی بێنێ
ئـــینسانی هـــەژار قـــەت دانـــامێنێ
بـــێجگـــە لەمـــانه لەبـــەر نـــاچاری
فـــەرزه ســـەرفی مـــاڵ لەبـۆ ڕزگـاری
لە دەســـتی پـــەستی دوژمـــنی کـــافر
لە ســـاڵی قـــاتی نـــان ئـــەبێ وافـــر
لە بـــاقی دەرد و مـــوشکیلەی زەمـــان
هـــەتا ڕزگـــار بـن گـەلی مـوسوڵمـان
بـــەڵام ئـــەمانه وێنـــەی دەس قـــەرزه
هـەژار کـە سـەرکەوت دانـەوەی فـەرزه
جـــا دەســـتووری وا بـــۆ بـــەنی ئادەم
بـــۆ بـــەکـــار نـایێ لە هـەموو عـالەم

❊ ❊ ❊

بێ بۆ حیكمەتی حەجی «بیت الله»
بۆ خاوەن دەستان لە چەرخی دونیا
بەوێنەی هەتاو ئەگرێ «خافقین»
نووری ڕەحمەتی خودای «مشرقین»
كە موسوڵمانان خاوەن ماڵ و جا
بڕۆن حازر بن لەلای «بیت الله»
جێبەجێ بكەن «مَناسك»ی دین
تەوافی كەعبەی قیبلەی سەرزەمین
یادی خودایە بە دڵێكی پاك
دڵ بەمە ئەبێ بە جامی ڕووناك
یادی ئیبراهیم «خلیل الرّحمان»
بانی «بیت الله» بە عەزم و ئیمان
یادی جیهادی «رسول الله»یە
كە ڕۆژی بەرزی چەرخی دونیایە
تایبەتی كاتی چوون بۆ مەدینە
بۆ زیارەتی ئەو نازەنینە
بارانی ڕەحمەت لەسەردا ئەڕژێ
دڵ بە نووری حەق تەواو ئەبرژێ
یادی یارانی فیداكارانی
بۆ دین بوون بە قۆچ، قۆچی قوربانی
هەتا تێبگەن كە دین و ئایین
چۆن بڵاوە بوو لەسەر ڕووی زەمین

بــێجگــە لەمــانە هــەزارن ڕەحــمەت
ئــەبارێ لەســەر کــۆمــەڵی ئــوممەت
کــە گــردەوە بــوون لەو دەر و دەشــتا
کـــە بـــەردی داوە بــەسەر بــەهەشتا
کــە گــەیین بە یــەك بــە یــەکیەتی دڵ
وەریان گرت لەیەك مەسئەلەی موشکڵ
کــە قســـەیان کــرد لە وەزعــی ئــەییام
لە چـــاری دەردو ئـــازاری ئـــیسلام
گشت ســـــەعاتێکـــی ســـەعادەتێکـــە
بـــۆ ئـــینسانی پـــاك عـــیبادەتێکـــە

❊ ❊ ❊

بـــێجگـــە لەمـــانە ئـــایینی ئـیسلام
لەســـــەر فـــــەرموودەی «سـیّد الأنـام»
هــات بــۆ ئــیتمامی دائــیرەی ئــەخلاق
هــات بــۆ پــیرۆزی ســەراســەر ئـافاق
یـــانێ ســـــەمەرەی ئـــادابــی ئـیسلام
ئــــەخلاقی بــەرزە لەبــۆ خــاس و عــام
یـــانێ بـــە داری ئـــەخلاق و ڕەوشت
ڕووی زەوی ئەبێ بە باغچەی بـەهەشت
یـــەقین بـــەم تــەرزە ئــایینی ئــیسلام
کـــــافیە لەبـــۆ ســــەعادەتی عــــام

لەمـــە جـــوانـــتر پـــێم بـڵـێ کـامە؟
کـــە ئـەمەی وتـمان دیـنی ئـیسلامە
لەمـــە زیـــاتر دیـــنت بـــۆچـــییە؟
کـــام چـــاکــە هــەیە لە دیـنا نـییە؟
نـــوقسان لە دیـــنا نـییە بـە تـەحقیق
ئـەگـەر مـوسوڵمـان بـێتە سـەر تـەتبیق

❊ ❊ ❊

یـــانێ «مـــحمّد» ئـــامادە کـــرا
بـــۆ دڵی عـــاقڵ بـــوو بــە چـــل‌چرا
کـــارەبای دیـنی زۆر خـاوەن بـەرقە
رەش و سپی و سوور لەوا بێ فەرقە
هەتاو کە هەڵهات بە ئەمری خەللاق
ڕوون ئـەکـاتەوە سـەراسـەر ئافاق
کـــوێرێ نـەیبینێ خـەتای ئـەو نـییە
چـــاوی خــۆی هـێزی بـینایی نـییە
زۆر بـــە ئـیحتیرام بـە دڵێکی سـاف
بــە بـاوەڕی سـاغ بکــە ئـیعتیراف
مـــوحەممەد ئـــاخر ڕەهـبەری دیـنە
بــــە حـــەق **«رحـــمةً لـلـــعالمین»**ە
ڕۆژێ کـــە هـــەڵهات بـەسەر عـالەما
تـــاوی دابـــەسەر بـــەنی ئـادەما

بـێ تـەفاوتە بـۆ چـینی و هـیندی
بۆ سامی و ئاری بۆ فورس و کوردی
هـەموویان بـران بـە دینی ئـیسلام
بە قـەدەر تـەقوا وەرئـەگـرن ئـیکرام
«فَــالْحَمْدُ لِــلّٰهِ رَبِّ الْــعٰالَمِینَ
وَ سَــلاٰمُ اللهِ عَــلَی الْــمُرْسَلِینَ»

❊ ❊ ❊

## پاش دینی ئیسلام تەریقەت چییە؟

**پرسیاری سێزدەهەم:**

مـامۆسـتا، بـە دڵ زانـیم کـە ئـیسلام
پەسەندە و بەسە لەبۆ خـاس و عـام
پـاش دیـنی ئـیسلام دیـنیتر نـییە!
ئـیتر پـێم بـڵێ تـەریقەت چـییە؟
دین بە وەحی حەق هاتە سەر زەوی
گەیشت بە عـالەم بـوڵەنـد و نـەوی
ئـــەگـــەر لە دیــنە ئــیسلام کـافیە
ئـەگـەر دیـن نــییە بـێ ئـینسافیە
دەمـێکـە بـە دڵ وێڵی ئـەم سـەودام
دڵ بـــــــریندارم، دامــــاوی دەوام

وەڵام:

شـــاگـــردی زانـام سـەروەری گـیانم
بــەندی جگــەر و نـووری چـاوانـم
من لەگەڵ تۆدام لەسەر عەقڵ و فام
پــیرۆزی نــییە بــێ دیــنی ئـیسلام
بەڵام هۆشیار بە ئیسلام یانێ چـی؟
بــە چ یـاسایێ ئـیسلام دێتــە دی
ئیسلام هاتە جـێ هـیچ بـاسی نـییە
لە ژوور ڕاســـتەوە ڕاســێتــر نــییە
واتـــە خـــالیقی تـــەوانـا و زانـا
پـــەری و ئـادەمی بــۆ دانش دانـا
دانش بـــناغەی بـینای عـیبادەت
لەســـەر زانســـتە قـەڵای سـەعادەت
کـە زانـستت بـوو خـزمەتکار ئـەبی
بۆ خـودای عـالەم تـاعەتکار ئـەبی
وەکوو دارێکـی پـڕ بـەری سـەربەرز
بۆ خۆت و بۆ خەڵك بەهرەدار ئەبی

❊ ❊ ❊

خــــزمەت وتـــار و ڕەفـــتاری ڕاســـە
کــە ڕاسـتی نــەبوو عــالەم هــەراسـە
وتـــار و ڕەفـــتار درەخت و شـــاخە
بـــاوەڕ ڕیشــــەیە، ئـــادەمی بـــاخە

ئـاوی ئـەم ڕیشـە و درەخـتی بـاخە
ئـیخلاسی مـەردی خـاوەن دەمـاخە
ئیخلاس بە فـەیزە و بـە سروشتی پـاك
بـە هـاومەشرەبی مـەردی دڵ ڕوونـاك
ئادەم بە ئیخلاس ئەبێ بە كـۆی «طـور»
ئـەبێ بـە مـەزهەر بـۆ تـەجەللای نـوور
واتــە و ڕەفـتار و بـاوەڕ و ئـیخلاس
چوار ڕوكنی دینن لەسەر شێوەی خاس
ئەم چوار ڕوكنەی بوون، ئیسلامێ ڕاسە
ئـەنا هــەر نـاوە و هــەر دەنگـوباسە
ئــەوەی دێتـە نـاو تـەنیا بـە شـێوە
ســوورەت ئـادەمی و بـە سیرەت دێوە

❋ ❋ ❋

خوا ڕەهبەری نارد بۆ ئـەم سـەر عـەرزە
بۆ تـەمێی هـۆشـیار بـەم دەرسـە بـەرزە
یـانێ بـەبێ خـووی ڕەهـبەری نـازدار
كـردەوەی ئـینسان هـەر ئێشـە و ئـازار
بـێسوودە حـاڵێ دوور لە حـاڵی ئـەو
كـــەماڵێ دوور بــێ لە كـەماڵی ئـەو
پــیرۆزی بـــەشەر ئـــەمەیە ڕەهــبەر
«مُكَــبَّر»ت بــێ و ئـەتۆش «مُـصَغَّر»
یانێ ئەو حەسەن، ئەتۆش حوسەین بی
لەسەر دەرزی ئەو بە عیلم و عەین بـی

بەڵام هۆشیار بەو خۆت مەکە پەرۆش
کە چووی بۆ بازار لای ئاڵتوون فرۆش
دەس‌بـــــڕ و دز و درۆزن زۆرە
بە سوورەت ڕووناك، بە سیرەت بۆرە
نـــەچیتە داوی دەس‌بـــڕی دەغـــەڵ
سـەرگەردان نـەبی بە هـەوا و ئـەمەڵ
نـــیشانەی پـــاکـان وایـە بـۆ فـەتوا
دووری لە هـــەوا، نـــزیکی تـــەقوا
لە زاهـــیری دیـــن قـــەتعەن لا نـادەن
حـــەقت پـێ وتـن مـلیان بـا نـادەن
لەلای ئـــەوانـــا خـاتر جـەم ئـەبی
موحیببی شـەرعی شـای خـاتەم ئـەبی
«ســــیمٰاهُمْ، ســـیمٰا أَهْـــلُ الشُّـــهُودِ
مِــــنَ السُّـــــجُودِ وَ مِـــنَ الْــجُودِ»
بـۆ کـەشتی نـەجات ئـەبێ بـە لەنگـەر
بـــە وێنـــەی "جـــوودی" «الله اکـــبر»
ڕوبـــانی ئـــەکـبەر[1]، ڕەبـبانی ئـەنوەر[2]
«رســـول الله»یـــە تـــا ڕۆژی مـــەحشەر
ڕەبـــبی لە گـــێژی کـــەشتی ئـــەم دونـــیا
ڕزگـــارمان بکـــە بـــۆ «رســـول الله»
لەو دونـــیاش لە ژێر ئـــاڵای ڕەســـوولا
بـــمانبە لەگـــەڵ فـــەوز و وســـوولا

١. کەشتیەوان، ئەوەی کەشتی لێ‌ئەخورێ. ٢. مەردی شارەزا بە پلە و پایەکانی بەندایەتی.

## بۆچی لاوان له ئایین دوورن؟

**پرسیاری چواردەهەم:**

مامۆستای زانا بـه یـاسا و دەسـتوور
دەماخ پڕ له مۆخ، دڵ تێراو به نـوور
مــادام ئــەم دینـه نـوورێکـی پـاکـه
هەرکەس دیـندار بـێ دڵی ڕوونـاکـه
دیــن ســەعادەته و پـیرۆزی ئادەم
هۆی سەربەرزییه بـۆ ئـەهلی عـالەم
بـۆچـی وا ئـیمڕۆ لاوانـی ئـیسلام؟!
لایــان دا له دیـن بـۆ بـاری ئـەوهام
بۆ بوونه دوژمن بۆ یاسای خـۆیـان؟!
بۆ ئەو دەستووره نازڵ بوو بـۆیـان؟!
بەهۆی چییەوه سـەریان لـێ شـێوا؟!
بۆچی دەروونـیان له ئـیسلام دێوا؟!
بۆچـی سـەرکز بـوون لەبـەر کـافرا؟!
بـۆ سـەودایـان دێ بـەسەر خـاترا؟!
پــێم بــڵێ دەوای ئـەم دەرده چـییه
بــۆمـان دەربـخه چـی هـەیه و نـییه

وەڵام:

نووری چاوانم، ڕووناکی دڵم
چرای پڕ سەفای ماڵ و مەنزڵم
جیهان دامەزرا بە «سنّت الله»
لەسەر ئەسبابە سەراسەر دونیا
لە مادده و مەعنا، «جَوهر»و «عَرَض»
هەرکام بەسوودن بۆ نەوعی «غَرَض»
یەکێ لەمانە بۆت نەبێتە جێ
ئیشت ماتڵە و ناکەویتە ڕێ
کە دینی ئیسلام عالەمی داگرت
کوفر و گومڕاهی لە ناوا لابرد
بە دڵ دوژمنی زۆری بۆ دەرچوو
بۆ تۆڵە سەندن هاتنە هاتووچوو
دڵیان هاتە سەر زیان لە ئیسلام
چ لە موسوڵمان، چ یاسا و نیزام
جا پاش ماوەیێ لە ئیسلام ڕابورد
گەلێ کارەسات بەسەریا ڕابورد
لەبەر بەدبەختی کاربەدەستەکان
دارکەوتە دەستی پەستە مەستەکان
غایاتی شەخسی وکورسی و خەیاڵات
گەلێ زیانی گەیاند بە وڵات

هـــەلی حـــازر کـــرد بـــۆ دەروون ڕێشـــان
بـــۆ ئـــیمحای ئـــیسلام بـــە ڕیشـــەکـێشـان
لە مـــــــەشریقەوە جـــــــەنگی تـــاتاری
ئـەم چـەرخـەی گـێڕا بـە کـوورەی نـاری
لە مـــــــەغریبەوە جـــــــەنگی ســـەلیبی
هـــــاتە دونــــیاوە زۆر بــــە عــــەجیبی
ئـــــەوەی ئـــــەمانە هـــێنـــایانە پـــێش
بـــە مـــیزانـــی عـــام قـــەت نـــایێتـــە کـــێش
چ بـــە قـــەتڵ و عـــام، چ تـــاوی تـــاڵان
چ لە ئـــــــازاری ژن و مـــــــنداڵان
چ لە ســـــــووتانی کـــتێبـــخانەکـــان
چ لە فـــــــەوتانی خـــــانەدانـــــەکـــان
بـــــــەشێکـــی زۆری ئـــاسیا ســـــووتا
لە ســـەد، نـــەوەدی مـــەعلوومات فـــەوتا
مـــیللەتی ئـــیسلام کـــز بـــوو بـــە جـــارێ
لە بـــــــاخا نـــــــەما مـــــەر درِك و دارێ
تـــا «صـــلاح الدّیـــن» شـــامەردی ئـــەییام
ســـەلیبی دەرکـــرد لە خـــاکـــی ئـــیسلام
پـــاش ئـــەم حـــەربانە لە ئـــەورووپاوە
دوژمـــــنی ئـــیسلام چـــاویان کـــراوە
کـەوتنە سـەر فـەننی عـولوومی سـەنعەت
خـــۆیـــان خـــازر کـــرد بـــۆ هـــێز و هـــەڵـــمەت

ڕۆژ بـە ڕۆژ ئـەچوون بـەرەو ڕووی پـیشە
خـــۆیـــان دامـەزران بـە هـێز و ڕیشـە
مـوسوڵمـانەکـان زۆر پاش کـەوتوو بـوون
نـیسبەت بە دوژمـن وێنـەی نـەبوو بـوون
بـــە ڕەغـــمی هـــەموو ئـەم کـارەساتە
ئـیسلام خـۆی ڕاگـرت لەم سـەر بـیساتە
تـــورکی عـوسمانی هـێزی پـەیدا بـوو
ئـــیسلام ژیـــاوە و ســـەرنگوون نـەبوو
بـەڵام بـە فـیتنە و شـۆڕشـی تـەیموور
ئـــــاسیا شــــێوا لە نـــزیك و دوور
تـــەکـــرار بــە یـاری خـوای عـالەمین
هـێزیـان گـرتەوە تـورکان لەسـەر دیـن
بـەڵکـوو بـە هـەڵمـەت بـەرەو ئـەورووپا
گـــەلێ وڵاتـــیان داگـــرت لە دونـــیا
جـــا ئـــەورووپایی کـــەوتنە ئـــەندیشە
تـــا ئـــەم تـــورکانە دەرکـەن لە ڕیشـە
لە ئــــێرانـــدا بـــە بـــیری قـــەوی
کـەوتنە «تأسـیس»ی حـوکمی سـەفەوی
هـــەر بـــە تـەگـبیر و قـیادەی ئـەوان
حـــوکمی سـەفەوی کـەوتە نـاو نـاوان
ئـێرانـیان گـۆڕی بـە فـیتنە و بـیدعەت
دایـــان لە دیـــنی ســوننە و جـەماعەت

دیــــنی شـــێعـــەیان دانــا بــە ڕەســمی
ئـــیسلام نــەماوە مــەگــەر بــە ئـیسمی
هـــەروا ئـــەفغانیش کـــەوتنە ئـــازادی
لەبـــەر ڕزگـــار بــوون لە شــەڕی عــادی
ڕشـــتەی پــەیوەندی مــەحەببەت پــچڕا
مـــوسوڵمـــانەکــان دەســتیان لێك بــڕا
جـا شــەڕی تــورك و ســوپای سـەفەوی
ئـــیسلامی داخست بـــۆ پـایەی نــەوی
کــاتێ کــە ئــەمان گــیرۆدەی شــەڕ بــوون
لە دەنگـــی تـۆپ و تــفەنگا کــەڕ بــوون
ئەوروپائییەکـان مـەشغووڵ بـوون بـە کـار
بــە فــەننی بــەسوود بـۆ غــایەی دەمــار
بـەو هــەلە هــەڵکــەوت فـرسەتیان هـێنـا
کـــەوتنە ئـــەفریقا و خـــاکـــی ئـاسیا
هـــــاتن بــــۆ هـــیند و ئـــەندەنووسیا
کـــەوتە لای ئـــەوان خــەزێنــەی دونــیا
لەولاوە خـــاکـــی غــەرب و جــەزائــیر
کـــەوتە بـــەردەسیان وەك نــانی حــازر
جـا ئـامادە بـوون بـۆ دەورەی دووهــەم
لەبــــۆ ئـــیستیلای تـــەواوی عـــالەم
ئـــەوروپائییەکـان چـــەنێ پــێشکــەوتن
مـــوسڵمـــانەکـان ئـەونە پـاشکەوتن

چـــونکی وڵاتـــیان پـــارە بـــوو
هـــەرکەسێ بـۆ خـۆی بـە قـەوارە بـوو
فـــەنن و ســەنعەتیش نــەبوو بـۆ ئــەمان
بــــــەم ئــــەسبابانە پـــاشکەوتن لەوان
جــا جــەنگی یــەکـەم هـاتە پـێشـەوە
دونــــیا کــــەوتە بــــەر دەرد و ئــێشــەوە
لەم ئــــەنجامەدا ئـــەوان کــــەوتنە ســەر
دەوڵەتـــــی تــورکیش فـــەوتا ســەراســەر
هــــەرچــــەن بــــە شــێوە دامــەزرایــەوە
بـــە شــێوە و یـاسای خـۆی نـەمایەوە
بـــەم ئـــیختیلال و ئـــەم سـەرەوسەرە
ئـــــاسیا شـــوبها بــــە مــــوستەعمەرە
ئــەوسا کــە ئــیسلام ئـەژیا بــە عـیززەت
خــاوەن بـوو لەبـۆ هـیممەت و هـەیبەت
کــە وەحــدەت نــەما شــریت خاوە بـوو
داوی حــــەو تـاڵی بــوو بــە تـاڵێ مـوو
ئــەمجار بـۆ مـەعنا و مـادەمان دەرچـوون
هەرچەن بەهێز بوون چەن قات زیاد بـوون
هـــەرکەس هــاودەمیان نــەبوو لە جــیهان
نــەیان هــێشت بـبێ بــە گـەورەی شـاران
هــەرکەس بـۆ ئــەوان خــزمەتکار نــەبوو
بــــە فـــێڵی ئـــەوان فــەوتا زوو بــە زوو

لەســـەر ئـارەزووو و مــەبەستی خـۆیـان
ولاتــیان بــەش کــرد بـۆ ئـیدارەیـان
مــەکــتەبیان دانـا بـە هـیوای بـەرزی
وەهــا کــە شـــوعوور لەبــەریا لەرزی
لەبـاتی «تَـثقیف»[1] بـە دیـن و ئـەخلاق
لە پـیشەی بـە نـرخ بـۆ هـەموو ئـافاق
ئـــــەخلاق و دیـــنیان خســـتە دواوە
وتــیان بــە ئــەخلاق بــڕۆ بـەولاوە
کــاتێ خـــاوەن دەس بــیری بگــۆڕێ
بــەو نــەزمە یـاسای عـالەم ئـەگـۆڕێ
کـە ئـوممەت گـۆڕای ڕێی «ثقافە»یان[2]
کـەوتنە تـەکـدیری[3] ئـەسلافی خـۆیـان
کــەوتنە ســەر هــەوای نـیزامـی تـازە
هـەریەك بـە نـەوعێ و بــە یـەك ئاوازە
ئەحزاب هاتنە پێش ئـەفکار بـوو بـە فـەرز
هــەوا خـێوەتـی هــەڵدا لەســەر عــەرز
لە گــەلێ شـــوێنـا نـیزامـی ئـیسلام
هــەر نـاوی مـاوە وەکـوو ماددەی خـام
بــێجگــە لەمـانە سـوپای «مُـغریات»[4]
دونـــیای داگـــیرکــرد ولات بـە ولات

---

١. فێرکردن و پەروەردە کردن.
٢. ڕووناکبیری، زانیاری.
٣. ئازاردان، ناشیرین کردن.
٤. فریودەران، هەڵخەڵەتێنەران.

مـــەلها[1] و سـینەما و تـەلەفیزیۆنـەکـان
مـەلعەب و نـادی و بـاقی شـوێنـەکـان
مـــــوسەووەراتـــی مـــەچەللاتی دوور
دونـیای داگـیر کـرد لە خـوار هـەتا ژوور
هـــێشـــتا هـــەر بـاشە بـەم نـیوەشەوە
کـــە دیـــنی ئـیسلام خـاوەن پـڕتـەوە
چـــونکی کـــەوکەبی عـالەمئارای دیـن
نـــووری قـــورئانە لەســـەر عـــالەمین
لەســـەر پـــڕتـــەوی قـــورئانی عـــەزیم
لەســـەر ئـــەخلاقی ڕەســوولی کـەریم
بـــــەشێ مــــاونەوە لە مـــوسوڵمـــانان
کـــە لەســـەر حـــەقن بـــە دیـــن و ئـیمان
لە هـــەموو سـینفێ مـوڵکـی و مـەدەنی
لەســـەر دیـــن مـاون بـە ئـەرجـومەنی
پـــاش چـــەرموزاخـی دوژمـنانی دیـن
دیـــنیان کـــردووە بـــە «حـبل المـتین»

❊ ❊ ❊

ئـــەمجار ئـــەپرسن کـامەیە چـارە
بـــۆ مـوسوڵمـانان لەم ڕووی دیـارە
من بـە حـەق ئـەڵێم چارە مـەعلوومە
بە دیـنی ئـیسلام خـەتی مـەڕسوومە

---

١. شوێنی ڕابواردن، قەحبەخانە.

گــەڕانــەوەیەیە بــۆ حـوکمی قـورئان
لەســەر ڕوونــاکـی دەسـتووری ژیـان
یــانێ ئــەم دیــنە بــۆ دیــن و دونــیا
ئــــینسان ئــەباتە مــەرتەبەی عــولیا
واتــە دوو شـــتە چـارەی مـوسوڵمـان
بژی بە عیززەت لەسەر ڕووی جـیهان
بگـــات بـــە خــودا لەگــەڵ ڕەزادا
بـــێ ئـــازار لە ژێر بـــاری ســـزادا
یەکـەم: عـەقیدە و کـردەوەی ڕەهـبەر
یـــانێ حـــەزرەتی «ســـیّد البَشــر»
دووهەم: هەر عیلمێ بەسوودە بۆتـان
بـــتانپارێزێ لە شـــێوەی ســـووتان
دین بیرە و بـاوەڕ، کـردەوە و ئـەخلاق
کـە ئـەبن بـە هـۆی ڕوونـاکـی ئـافاق
فــەن عــیلمێکــی وا ســبەینێ بــڕوا
لەبـــۆ پـــێشکـــەوتن هــەتا ڕۆژاوا
لە هەموو فـەننی عـەرزی و سـەماوی
کــە ئـەبێ بـە هـۆی چـاری دامـاوی
ئێمـەیش ئـینسانین وەهـا بـێینە دەو
زۆری پــێ نــاچێ ئـەگـەینە پـڕتـەو
مــن هــیوادارم کـە هــۆشـیارەکـان
بــۆ ئــەم چـارەیە بێنـە سـەر تـەکـان

# ڕازێ!

ڕازێکم هەیە بۆ بەهرەمەندان
لە ڕازی کۆنەی گەلی پێشینان
یەکێ عاشق بوو بەوێنەی «لەقلەق»
لە دونیا گەردی تەبەق بە تەبەق
گومانی وا بوو لەقلەق پیرۆزە
بۆ هانا و هاوار تەیرێ دڵسۆزە
وتی: چاك وایە بڕۆمە پەنای
بە هەواڵ پرسی و بە مەدح و سەنای
بپرسم هەواڵ بۆ بەچکەکانی
بۆ برا و دۆس و ئاشناکانی
بەڵکوو بە سۆزی دەروونی پاکی
دۆعام بۆ بکا بۆ دڵ ڕووناکی
جا هەستا و ڕۆیشت بە قەدر و ئیکرام
بۆی تەقدیم فەرموو درووود و سەلام
پێی وت: ئەی حاجی لەقلەقی عەزیز
ئەی تەیری دڵسۆز بۆ خاوەن تەمیز
دڵسۆزی ئادەم، دوژمنی ماران
جیهانگەردەکەی ڕووی ڕۆزگاران

دەمێکە چاوم نەکەوتووە پێت
وا ئێستە هاتم وەستام لەبەر پێت
ئەحواڵت چۆنە لە دەستی خەڵکان
چۆنە ئەحواڵی وردە بەچکەکان
حاجی لەقلەق گیان تەیری گەلگەلی
چۆنە سیمورغت تۆ عەشقی عەلی
چۆنە ئاشنای سینە و دڵ سافت
هاوڕازی نازی پاش قوللەی قافت
من شادمانم بە شادی ئێوە
بۆ هەواڵ هاتم وەستام بە پێوە
کە لەقلەق بیستی ئەم ڕاز و نازە
ئەونە دڵشاد بوو ئەتوت شابازە
شەقەی دا لە باڵ، لە سەر هاتە خوار
بە خۆش ئامای دۆس کەوتە سەر وتار
باسی دڵخۆشی خۆی و بەچکەی خۆی
باسی سیمورغی گێڕایەوە بۆی
لەپاش ماوەیێ بە دەور و دیمەن
ژیان پێکەوە لە ساحەی چیمەن
کاتێ هاتە پێش وادەی جیایی
کابرا هاتە باس بۆ ماڵئاوایی
لەقلەق پێی فەرموو: چییە دڵخوازت
بەڵ بەجێ بێنم ناز و نیازت

وەڵامــــی داوە: مـــن دڵبـــەندی تـۆم
ســاغی تـۆم ئـەوێ و دۆعـایێ بـۆ خـۆم
جـــا بــە سـۆزی دڵ جــەنابی لەقـلەق
ســەری هــەڵبـڕی بـۆ سـەمای ئـەزرەق
وتـــی: هـــەرچــەنێ مــن شــەرمەسارم
رەبـــبی بـــۆ یـــاران مـــن تکـاکـارم
هــەرگیز نــەیێشــێ لە جـەستەی ئـەوان
ئێسقانی بێ گۆشت، گۆشتی بێ ئـێسـقان
لەنـــــاو ئـــــەمانا بـــــەتایبەتی دڵ
ئــەمجا ئــێشـی دان، مـوشکڵە مـوشکڵ
بـــەڵام ئـــاسانە چـــاری دان ئــێشـان
یەکـەم: دەرمـانە و دووهـەم: دەرکـێشـان
چاویش نـەمێنـێ چاری، کـوێر ئـەکـرێ
بـــەڵام دڵ نـــەخۆش بــە ئــازار ئــەمرێ
هــەرکەس بــێ دڵ بـوو گـیرۆدەی دەردە
کـــاری مـــوشکڵە و هـــەناسەی ســـەردە
گـــەلێ لەنـــاو خـــۆ دڵیـــان بـــئێشـــێ
هـــەرگیز مـــەبەسیان نـــاچێتــە پـــێشـــێ
هــەر گـەلێکم دی کـە دڵیان ساغ بـوو
دیــن و دونـیایان بـە حـەق پـەرداخ بـوو
بــەڵام ئــەو گــەلەی دڵیــان ســاغ نــەبێ
بـــە داخـــی عـــالەم دڵیـــان داخ ئــەبێ

هـەر بـێ دڵی بـوو بـۆ گـەلی ئیسلام
وا پـاشی خسـتن بـۆ جـەوری ئـەییام
مـوسوڵمـانەکـان هـەتا یـەك دڵ بـوون
هـەموو خـاوەنی مـاڵ و مـەنزڵ بـوون
مـن هـیوام وایـە بـە یـەکـیەتی دڵ
بگـەڕێـنەوە بـۆ مـاوا و مـەنزڵ

❊ ❊ ❊

## جەبر و ئیختیار

**پرسیاری پازدەهەم:**

مامۆستای زانای، خاوەن بیر و هـۆش
دەرمـانی دڵی ئـینسانی نـەخۆش
نـوختەیێ هـەیە بـناغەی ئـیشە
لە سـەرچـاوی دڵ مـایەی تـەشویشە
وەکوو خۆت فەرمووت خالیقی عالەم
خـالیقە لەبـۆ کـائینات سـەرجـەم
هەر شتێ خواستی خوای لەسـەر بـێ
ئـەبێ هـەر بـبێ و نـەبوونی نـابێ
ئیتر بۆچ بـەشەر لەسـەر خـێر و شـەڕ
وەرئـەگـرێ جـەزا و ئـەبینێ زەرەر

ئـــەم حـــەقیقەتەم بـــۆ بـــەیان بکـــە
دڵی بـــیمارم بـــۆ دەرمـــانْ بکـــە
کـــە خـــوا خـــالیقە بـــۆ کـــرداری مـــن
چـــی هـــۆی جـــەزایـــە، یـــا ئـــازاری مـــن
جا کە قەزای حـــەق هـــەرگیز نـــاگـۆڕێ
بەشەر بۆ پارێز بـۆچـی هـەڵسـووڕێ

**وەڵام:**

هێزی ئەژنۆی دڵ، نـووری چـاوانـم
هـــۆی ئـــاسایشی مـــاوەی ژیـــانم
ئـــایین‌پەرستان لە ڕووی ڕۆزگـــار
بـــاوەڕیـــان وایـــە خـــوای پـــەروەردگار
پەروەردگارە بۆ گشت مـەوجوودات
بێ‌گیان و گیاندار، بەشەر حەیوانات
هـــەروەها لەبـــۆ کـــاری نـــاچاری
وەکوو مـەرگ و ژیـن بـە بـەختیاری
وەکـــوو جـــوانـــی یـــا نـــاشیرینی
وەکوو سیمای پاك کە خۆت ئەیبینی
ئـــەوەی مـەوزووعی بـاسی جـارییە
تـــەنیا کـــردەوەی ئـــیختیارییە
وێنـــەی وتـــار و کـــردەوە و ڕەفـــتار
وەکوو بەخشین و نۆشینی هـۆشـیار

بــە بــیری گــەلی ســوننەتی ڕەهــبەر
ئەمەیش مەخلۆقە بۆ خودای ئەکبەر
تــــەنیا کــــەسبەکــە لەبــۆ ئــادەمە
بــاقی حــەواڵەی خــودای عــالەمە
بــۆ ئــەم کــەسبەیە تــەکلیف کــراوە
لەســـەر ئــەم کــەسبە تـۆڵەی دانـاوە
بـــەڵام بـــەبیری مــاعەدای ئــەمان
نــەوعێکــیتره ئــەوزاعــی جــیهان
جـــا بـــا درێژه بـــەم بــاسه بــدەین
بـاسی بـیرەکـان بـه ڕاسـتی بکـەین
❋ ❋ ❋
لای «مـــعتزله» ئــیش بــە ئــیختیار
مــەخلۆقــی عــەبدە بــەبێ «اضـطرار»
لای «فلاسفه»یش مـەخلۆقـی عـەبدە
بــەڵام بــە ڕشــتەی نــاچاری بــەندە
چونکی لای ئەوان ئەسباب هاتە جێ
«تــخلّف» مــەنعە و «مســبّب» ئــەبێ
ئـــەم دوو بـــیرانـــە لامــان بــەتاڵە
ئــیجاد لەبــۆ عــەبد قــەتعەن مــەحاڵە
بــەشەر نــازانــێ چــۆن ئــەبێ ئــەنجام
نــازانــێ چــەندە حــەرەکــەی ئــەندام

چـــلۆن خـــالیقی بـــۆ نـــەزان ئـــەبێ
زانـــا لەم ئـیشە زۆر حـــەیران ئـــەبێ
**«أَلا يَـــعْلَمُ مَـــنْ خَـــلَق»** [١] وابـــێ
ئـــیجاد بـــۆ جاهیل بـــە قـــەتعی نابێ
عەلاوەی نـــەسسی خـــالیقی بێچوون
**«وَاللهُ خَــلَقَكُمْ وَ مـا تَـعْمَلُون»**
**«اللهُ خَـــالِقُ لِكُـــلِّ شَـــيءٍ**
**غَـــامٌ لِكُـــلِّ ضَـــوْءٍ وَ فَـــيْءٍ»**
بـــۆ یـــارمەتی بـــوو دەلیـــلی ئـــایەت
بەڵکوو بۆت ببێ بە هـــۆی هـیدایـــەت
لەلای «جـــبریّە»یش ئـــینسان نـــاچارە
بـــەوێنـــەی مـــردوو، یـــا بـــەرد و دارە
ئەوەی ئێتـــەجێ بـــە خـــودایـــە و بـــەس
بـــەشەر بـــێ دەخـــڵە حـــەتتا لە نـــەفەس
ئـــەمەیش خـــەتایە، چـــونکوو ئـــەزانـــین
دەخـــڵـــمـــان هـــەیە هـــەتا بـــتوانـــین
بتجـــووڵێنـــەوە تـــا هـــەستیتەوە
یـــا خـــۆت بـــە دڵخواز بجووڵیـتەوە
فـــەرقێکـــی ڕۆشـــن لە بـــەینا هـــەیە
لەمـــا چـــارەدار، لەو بـــێچـــارەیە
کـــاتێ هـــەڵکـــەوتی خـــۆت دائـــەمێنـــی
دەســـتت پـــێوەنـــین تـــۆڵە ئـــەستێنـــی

---

١. ئایا کەسێك ئەم خەڵکەی دروست کردبێ، بە نهێنی ناو دڵیان نازانێ؟.

ئـەگــەرنا بـۆچــی تـەکلیفی خـودا
ڕوو نــاکــا لە کـەس لە کـاتی خـەودا
یــانیٚ خــیتابی تــەکــلیف و ئــیلزام
نەك «خِطاب الوَضع» بۆ حیفزی نیزام

❊ ❊ ❊

بــە بـیری ئـوستاد[1] بـە «قُـدرَتَین»ە
خودایە و بەندەیش هێزی بۆ عـەینە
بە خواستی خودا هێزی بـەشەر دیٚ
هــەتاکــوو تـۆڵەی لەبۆ بـێتـە جـیٚ
ئەمەیش لای ئـێمـە دووره لە هـودا
بــەشەر شــەریك بـیٚ لە کـردەوەدا
لای «بــاقلانی» خــەلقی زاتــی کـار
مــەربووتی هــێزە بــۆ پــەروەردگار
وەسفی تاعەت و مـەعسیەت ئـەبیٚ
بـە هــێزی بـەندە جـیٚبـەجیٚ ببیٚ
بەن لەبـۆ حـەقە، ڕەنگ لەبـۆ بـەندە
لەم ڕەنگــبازییەش دڵ دەردمــەندە
ئەگەر بەن نەبیٚ ڕەنگکەر چی ئەکا
ساقی بەبیٚ جـام ئـاو لە چـی ئـەکـا

❊ ❊ ❊

---

١. ئەبووئیسحاقی ئیسفەراینی.

بۆ ئەهلی سوننەت بە یاسای کیتاب
بۆ خودا خەلقە و بەندە «اِکتِساب»
لەم کەسبا واتەی دوو کەس ئێتە دی
یەکەم «ئەشعەری» دوو «ماتریدی»
بە دڵ هۆشیار بە ئەگەر ئەتەوێ
کەسبی ئەشعەری بۆتۆ دەرکەوێ
خودا بە قودرەت عیلمی داوە پێت
لە خێر و شەڕی ئەوەی ئێتە ڕێت
هێزی ئیرادە خواستی پێت داوە
کاتێ کارێ بوو دایر لەو ناوە
خۆت بە داماوی دەردیسەر نەدەی
تەرجیحی لایێ لە دوو لا بدەی
قودرەتی داوە ئەتوانی بیکەی
هەر لایێ بە خواست تەعینی بکەی
ئەم سێ سیفەتە دیارە و مەشهوود
داویە بە بەندە خالیقی مەعبوود
جا کاتێ زانست ڕووی کردە کارێ
خواستت هاتە جێ ڕووی کردە بارێ
قودرەتت دێ بۆی بێنیتیە وجوود
لەویا بۆت ئەکا «خالق الموجود»
دەی ڕێکەوتنی ئەم سیفەتانە
کەسبە بە بیری ئەم زانامانە

هەرچەن تەئسیریان نییە بە ئیجاد
چوون ئیجاد «حَصر»ە بۆ خودای عیباد
بەڵام بە عادەت ئەبن بە سەبەب
بۆ ئیجادی حەق باش و مورەتتەب
بۆ سەبتی ئەمە شەخسی ئەشعەری
بەیانی ئەکا لە هەوا بەری

* * *

یەکەم: بە عیلم و خواست و تەوانا
کردەوە ئەکەین لە ڕووی جیهانا
بە ڕووناك دیارە لەناو ویجدانا
عەلاقەدارین لە کارەکانا
غەیری وجوودی ئەم سیفەتانە
سیرڕی عەلاقە لامان پەنهانە
مانیعی نییە نەزانین چییە
سیرڕی عەلاقە زۆر پەنهانییە

* * *

دووهەم: دیارە لەسەر ڕووی ئافاق
خوا تەکلیف ناکا بە **«ما لا یُطاق»**
هەر کردەوەیێك لە تاقەتا بێ
هۆی تۆڵەی تۆیە هەرچۆن پەیدابێ
ئەوەندە هەیە بەیانی تاقەت
بۆمان ناوترێ لەسەر حەقیقەت

* * *

سێهەم: ئادەمی ئەگەر بێبەش بێ
لەو کردەوانە لەوۆ ئێنە جێ
بێسوود دەرئەچێ لەسەر ڕووی جیهان
وەحی و ناردنی گەلی ڕەهبەران
ئەمەیش لە حیکمەت بە ئەمیال دوورە
کەوا بوو بەشی بەشەر زەروورە

❊ ❊ ❊

ئەمجار بڕوانە وێنەی «مُهتَدی»
بۆ کەسبی بەشەر لای «ماتریدی»
ئەڵێت ئادەمی مەخلووقە و ناچار
لە خەلقی خۆیا و سیفاتا یەکجار
یانێ لە ئەسڵی ئەوسافەکانا
زانست و خواست، هێزی تەوانا
بەڵام بۆ ئەوە چارێکی هەبێ
لە کارا وێنەی بەرد و دار نەبێ
خودای بێهەمتا بەبێ دەردیسەر
سەرفی ئەو خواستەی داوە بە بەشەر
یانێ ئەو وەسفە کە خواستی تۆیە
رەبتی بە کار و بە دەستی تۆیە
وەکوو چۆن بینش بە ناچارییە
بەڵام ڕوانین ئیختیارییە
بە خواستی کوللی تیایا ناچاری
لە سەرفی ئەوا بە حەق موختاری

ئـەم سـەرفە مـەڵێ خـەلق و ئـیجادە
ئـیجاد بـۆ «عَـین» و «عَـرَضْ» ئـازادە
ئـەم سـەرفە وەسـفێ ئـیعتیبارییە
لەسـەر «تـفویض»ی زاتـی بـارییە
جا ئەگەر مەیلت «تفویض»ە بۆ حەق
ئـەشعەری بگـرە، ڕاست و «مُصدَّق»
ئـەگـەر تـالیبی بـۆ ئـارامـی دڵ
لای «مـاتریدی» وەربگـرە مـەنزڵ

❊ ❊ ❊

کە باش حـاڵی بـووی لە دەخـڵی بـەشەر
بـە یـاسای کـەسبی ڕاسـتی مـوعتەبەر
بـزانـە خـودا خـواسـتی هـەرچی بێ
لەسەر خـواسـتی ئـەو ئـەشیا ئـێتە جێ
بـەڵام بـە خـواسـتی حـەزرەتی باری
لە کـەسبی خـۆتـا قـەت نـاچار نـابی
عـیلم و ئـیرادە و تـەقدیری مـەشهوور
مـانای وا نـییە تـۆ بـبی مـەجبوور
مـەعلوومی ئـەهلی عـیرفان و عـیلمە
کـە ئـیرادەی حـەق تـابیعی عـیلمە
عـیلمی ئـەزەلیش تـابیعی فـیعلە
فـیعلی موکەلللەف مـەتبووعە و ئـەسڵە

خـــودا زانـــیویە تـــۆ بـــە ئـــیختیار
لە «مُســـتَقبَل»دا چـــۆن ئـــیتە کـردار
لەســەر ئــەو عــیلمە ئــیرادەی فــەرموو
وا خواستی عیلمی و عیلمی فیعلی بوو
یـــانێ زانـــیویە کـــاتی «مُســـتَقبَل»
چـلۆن «مُکَـلَّف» ئـێتـە سـەر عـەمەل
خواسـتێ بـەو جـۆرە ڕووی کـردە ئـەشیا
هـــەرکام لەو کـــاتا بـۆی قــەرار دریـا
کـــە بـــڕیـــارمان دا «قــضا» زانســتە
خواستیش بەو شـێوە ڕووی لە مـەبەستە
قـەت ئـیجاب نـایێ بـۆ کـردەوەی تـۆ
تـۆ هــەر مـوختاری لە کـردەوەی خـۆ
وێنــەیێ ئــەڵێم بـۆ کـەشف و «تـوضیح»
لەلای عـــــاقڵان شـــیرینە و مـــەلیح
ئـــەگـــەر کـــاشفی بـــزانـە گـەنجێ
ئـــەدۆزیـــتەوە بـــێ دەرد و ڕەنـــجێ
یـــاخود بـــزانـــی ئـــیمڕۆ لە بـــازاڕ
بـە هـۆی شـتێکـۆ ئـەگـەی بـە ئازار
لەســـەر تـۆ نـابێ بـە هـۆ بـۆ «اِجبار»
نـە بـۆ گـەنجەکـەت، نـە لەبـۆ ئـازار
هـــەروایـــە عـــیلم و ئـیرادەی بـاری
بـۆ کـردەوەی تـۆ ئـەتۆیش «مُختار»ی

لە ئـــەسڵا زانـــی بـــە ئـەحواڵی تـۆ
بـۆیـە خـواسـتی بـوو بۆ ئـەفعالی تـۆ
خواستی تۆ نابێ بەبێ خـواسـتی حـەق
خواسـتیشی بۆ عـیلم تـابیعە و «مُـلحَق»
عیلمی حەق کەشفی کردەوەی تۆی کـرد
«فَـــجَرىٰ بِـــهِ التَّـــقْديرُ الْـــمُطْلَق»
ئـــەمە بـــۆ عـاقڵ مـەفهوومی سـافە
غـــەیری ئـەم شـێوە شـێوەی خـیلافە

❊ ❊ ❊

بـــێـــنە ســـەر لادان لە ئـەسبابی شـەڕ
یـــا کـــۆشش کـــردن لەبـۆ خـێر و فـەڕ
«ســـنّة الله»یـــە لەســـەر ڕووی جـــیهان
ئـــەسباب و «شـــروط» بـــۆ ڕووداوەکـان
گـــەلێ ئـــەسباب و گـــەلێ «مَـــوانِـــع»
گـــەلێ «دَواعـــی» و گـــەلێ «دَوافِـــع»
ســـەبەب و شـــەرت و مـــانیع و ئـالات
بـــۆ ئـــەشیا هـەیە لە ڕووی سـەربیسات
نـــان و ئـــاو مـــایەی ژیـــنی ئـــینسانە
ســـوجدە و عـــیبادەت مـایەی ئـیحسانە
لافـاو بـۆ تـەخریب، ئـاگـر بـۆ سووتان
هـــێرشـــی دوژمـــن هـۆیـە بـۆ فـەوتان

شـــــۆڕش و غـــەوغا مـــایەی فـــەنایە
ژیـن نـاخۆش ئـەکـەن لەم ڕووی دونیایە
خـــودایش ئـــامیرە بـــە ئـەسبابی خـێر
«نـاهی»یـە لە زیـان بۆ خـۆت و بـۆ غـەیر
تـۆیش لەسـەر یـاسا ئـەبێ تـێکـۆشـی
شـــیرینی و تـــاڵی ئـــەبێ بـــنۆشـــی
بـــەڵام نـــازانـــی لەسـەر کـام سـەبەب
نـەجاح وەرئـەگـری و ئـەگـەی بـە مـەتڵەب
یـــا کـــام مـــانیعت لێ هـــەڵئـەسووڕێ
ڕێگـــەی مـەقسوودی خـێرت ئـەگـۆڕێ
خـــودا ئـەزانـێ بـە چـی پـێ‌ئـەگـەی
بـە کـام کـۆسپی ڕێ بـە مـەبەس نـاگـەی
لە..............................عـــــەقڵ و فـــام
..........تێکۆشی بە تۆ .......................ئەنام[1]
نـــــابێ تـــۆ بـــڵێیت «قَـــضا» بـــڕاوە
ئـــیتر بـــێ‌ســـوودە کـــۆشش لەم نـاوە
قـــەزای نـامەعلووم چـۆن ئـەبێ بـە هـۆ
لەبـــۆ تـــەممەڵی و ســـەرگەردانـــی تـۆ
کـاتێ هـاتە جـێ هـۆی سـوود یـا سـزا
بـــۆت دەرئـــەکـــەوێ تـــەقدیر و قـــەزا

١. ئەم بەیتەش لە تێکستەکەدا ناتەواوە.

ئـــایەی ﴿لَـــوْ كُـــنْتُمْ فـــي بُـــيُوتِكُمْ﴾ [١]
بـــۆ قـــەزایـــەکـــە لە لای تـــۆیـــە گـــوم
تـــۆ خـــۆت ون مـــەکـــە لە مـــەیدانـــی کـــار
«وَاللهُ هُـــــوَ الْـــــوَاحِـــــدُ الْـــــقَهَّار»
ڕاســـتە فـــەرموودەی ڕەهـــبەری کـــوللە
«كُـــلٌّ مُـــيَسَّر لِـــما خُـــلِقَ لَـــه» [٢]
تـــێکـــۆشـــە لەســـەر یـــاسای مـــوستەقیم
لادە لە هـــــەوای ئـــــەفکاری ســـــەقیم
ئـــەمەیە ڕێگـــەی عـــەقڵ و هـــۆش و فـــام
ئـــەمەیە چـــرای نـــەجات لە ئـــەوهام

❋ ❋ ❋

بـــێجگـــە لەمـــانە، ئـــینسانی والا
کـــە لە عـــەقڵ و هـــۆش نـــەبێ تـــەوەللا
ئـــەزانـــێ بـــەشەر جـــیایە لە حـــەیوان
بە عەقڵ و عیلم و ئـەخلاق و ویـجدان
بە فەنن و پیشەی مـاددی و مـەعنەوی
بە سەعی و کۆشش بـە بـازووی قـەوی
تـەبعەن مـەدەنی و بـە یـەك مـوحتاجن
بـــۆ یـــارمەتی یـــەك زۆر نـــاعیلاجن

١. بەشێکە لە ئایەتی ١٥٤ی سوورەتی ئالیعیمران، واتە: ئەگەر ئێوە لە ماڵ و حاڵی خۆیشتانا بوونایە...
٢. هەرکەس ئامادە کراوە بۆ ئەوەی بۆی دروست کراوە.

هــەروا بــە هــەوای ئارەزووی نــەفسی
«تَعَرّض» ئەکــەن بــۆ غــایەی شــەخسی
کــەوابــێ ئــەگــەر جــوزئی ئــیختیار
نــەبێ بــۆ بــەشەر بــە کــەسب و کــردار
ئــەگــەر یــاسایێ نــەبێ بــۆ عــەمەل
ئــەگــەر «حــدود»ێ نــەبێ بۆ ئــەمەل
نــــیزامــــی عــالەم ئــەڕوا بــە جــارێ
بــۆ کــەس نــامێنــێ قــەول و قــەرارێ
کەس مەخسووس نابێ بە موڵك و ماڵێ
کــەس تــێ‌نــاکــۆشــێ لەبــۆ کــەماڵێ
کــەس مــەسئول نــابێ لە جینایەتی
کــــەس مــەورد نــابێ بــۆ شکــایەتی
چــــونکی لە ئــــیشا ئــــەڵێ نــاچارم
مــــەربووتی قــــەزا و بــــێ‌ئــیختیارم
وێنــەی قــەڵەمــی دەســتی «خــطّاط»م
یــاخود مــەقەسی دەســتی «خــیّاط»م
کــــەوابــێ عــەقڵەن فــەرزە ئــیختیار
بــبێ بــۆ بــەشەر بــۆســەعی و کــردار
فــــەرزە یــاسایێ بــیکا بــە «مــقیاس»
راگــــیری بکــــا لەبــۆ عــام و خــاس
ئــەو حــەقی چــییە لە ســیڕڕی قــەزا
ئەبێ بە هۆی سوود یا بە هۆی سزا

قـــەزا شـــاملە بـــۆ بـــەشی «مُـبْرَم»
نـــاگـــۆڕێ وەکـــوو ئـــایەتی «مُـحْکَم»
شـــــــاملە لەبـــــــۆ «مُـــعَلَّقات»یش
لەبـــۆ ئـــەسباب و لەبـــۆ ئـالاتیش
تـــۆیش بـێخـەبەری لەم دوو نـەوعانە
کـــامە ئـــێتـــە ڕێت لەم ڕووی جـــیهانە
ڕێگـــەی خـــۆت بگـــرە «کَـــمٰا تَشٰـــاء
وَ یَـــــــمْحُو اللّٰهُ لِـــــمٰا یَشٰـــــاء»[1]
ئـــێمـــە ئـــەخوێنـــین وێنـــەی قـــوتابی
«وَ عِـــــــنْدَ اللّٰهِ أُمُّ الْکِـــــــتٰابِ»

❊ ❊ ❊

## قەزا و قەدەر

**پرسیاری شازدەهەم:**

مـــامۆســـــتا لێرا نـــوختەیێ بـــاوە
بـــا عـــەرزت بکـــەم تـا لە بـیر مـاوە
مەشهووری عامە بێ دەردی‌سـەری
«حَـــذَرْ لٰا یُـــغني عَـــنِ الْـــقَدَرِ»[2]
«حـذر» لە قـەدەر مـادام بـێ‌سـوودە
خۆ پاراستنمان بۆ چی مـەقسوودە؟

١. بەشێکە لە ئایەتی ٣٩ی سوورەتی ڕەعد، واتە: ئەوحوکمەی خوا بیەوێ لایئەبا.
٢. وریایی و خۆپارێزی مرۆڤ لانادات لەو شتانەی کە خوا دیاریکردووە و بڕیاری لەسەر داوە.

وەڵام:

نــووری چــاوانــم ئــەو واتــە ڕاســە
بـەڵام مـەعناكـەی لەلای «خـواص»ە
پــــەروەردگاری زانــــا و تــــەوانــــا
لە ڕووی جــــیهانا ئــــەسبابی دانــــا
بــە نـان تـێر ئـەبی، بـە ئـاویش تـێراو
كــوێر ئــەبێ ئــینسان كـە بـڕا لە ئـاو
شمشێر ئەتبڕێ و خـوێنت ئـەڕێژێ
مــاری خـاوەن ژار ئـینسان ئـەكـوژێ
خوایش پێی داوین دوو هێزی جـوان
هێزی جەلبی خەیر، دەفعیش بۆ زیان
فــــەرموویەتی پــــێت: لادە لە زیــان
ڕاكــێشــە بــۆ خــۆت ئــەسبابی ژیـان
تۆش لەسەر زانست وەها ڕێ ئەكـەی
تا سوود وەربگری و بە زیان نـەگـەی
هــەر بــەم یــاسایە جــیهان ئـاوایــە
ئــــادەمی ئــــەگــا بــە پــایە و مــایە
بــەراوردت كــرد، بــە ڕاســی وابـوو
ئـەم یـاسا لەگـەڵ «واقـع»دا دەرچـوو
تــــا پــــارێزت كــرد لە ئــیشی زیــان
ساغ و سەلامەت دەرچووی بـۆ ژیـان

تا خۆت هاوێشتە ناو ئیشی بێ جێ
نە شانت ماوە، نە نان و نە جێ
بەڵام هەروەها خودایش زانایە
بە چی تووش ئەبی لەم ڕووی دونیایە
ئەزانی ڕۆژێ کە ئاکامت هات
تۆ خۆت ئەخەیتە ناو چاڵی نەهات
جا لەم کاتەدا خۆت «حذر» ناکەی
تا لە مەرارەت خۆت ڕزگار بکەی
یا پارێزەکەت لە بازێ دەردە
لەویا دەردێ تر لەسەر ڕێی مەردە
بەمیان تووش نابی، بەویانە ئەمری
چونکە ئاکام هات ئەبێ هەر بمری
یانێ هەر «حذر» لە قەزای موبرەم
بێسوود دەرئەچێ بۆ بەنی ئادەم
ئەنا گەر حەزەر ئەگەر بێسوودە
نەخۆشخانەکان بۆچی مەوجوودە
بۆ دەرمان ئەخۆی کاتێ نەخۆشی؟!
بۆ پارێز ئەکەی لە تاڵی و تورشی؟!
بۆچی ئەخوێنی بۆ عیلم و کەماڵ؟!
بۆچی ئەکۆشی لەبۆ ژن و ماڵ؟!
بۆ قەڵا ئەگری لە تیپی دوژمن؟!
بۆ پەنا ئەگری بە مەردی زامن؟!

بـــە کـــورتی قـــەزا بـــۆ تـــۆ دوانـــە:
«مُـــبْرَم» ئـــەویانە، مـــۆڵەق[۱] ئـــەمیانە
مـــوبرەم «لَـــوْ کُـــنْتُمْ فـــي بُـــيُوتِکُمْ
قَـــــــدْ احْـــــتَرَقْتُمْ بِـــــزُيُوتِکُمْ»
مۆڵەق هـەستە پـێ و دوژمـن ڕامـاڵە
ئـــەگـــەر مـــەبەستت پـــارێزی مـــاڵە
ئـــیتر هـــەڵەيـــە تـــۆ حـــەزەر نـــەکەی
لە یاسای ڕەسای عەقڵ و دین لادەی
یـــانێ نـــيزامـــی عـــالەم «حـــذَر»ە
عـــەقڵ و دیـــن لەمـــا خـــاوەن خـــەبەرە
«جَـــــلَّ شَأْنُـــــهُ الْـــعَزِيزُ الْـــعَالي
فـــــي شُـــــئُونِهِ عَـــلَى التَّـــوَالي»

* * *

۱. واتە: معلق

# قەزای موبرەم و قەزای موعەللەق

**پرسیاری حەڤدەهەم:**

مـــامۆســـتا، چـــرای دڵەی ئـــاوارەم
بـــە دڵ بـــێدار بـــە لەم پـــرسیارەم
هـــەموو ئـــەزانـــین بـــە شێوەی سـەواب
کـــە مـــوسەببەبات فـــەرعن بـۆ ئـەسباب
بـــوونی مـــومکینات لەســـەر ئـــەسبابە
بـــێ ســـەبەب‌سازی مـــەقسەد نـــایابە
بـــەم شـــێوە وتـــمان قـــەزای زاتـــی حـــەق
بـــەستەی ئـــەسبابن، یـــانێ «مـــعلّق»
لاش بکـــــــەینەوە لای زاتـــــی خـــــوا
بـــە هـــەموو شـــتێ خـــەبیرە و زانـــا
لەســـەر ئـــەم یـاساش «**قَـدْ جُـفَّ الْـقَلَمْ**»
قەزای حەق هەموو مەختوومە و مـوبرەم
ئـــیتر یـــانێ چـــی بـــە مـــیزانـــی حـــەق
قـــەزای «مـــبرم» و قـــەزای «مـــعلّق»
خۆ عـیلمی خـوا هـەرچۆن جاری بـوو
گـــۆڕانـــی نـــییە بـــە یـــەك ســـەری مـوو

**وەڵام:**

شـاگـردی شـیرین، دەرمـانی دەردم
مــایەی ڕزگـاری لە ئـاهی سـەردم
ئەوەی باست کرد هەمووی سەراسەر
خـــیلافی نـــییە ڕاســـتە و «مــقرّر»
بە ڕەبـتی ئـەسباب گشت مـوعەللەقن
بە زەبـتی عـیلمیش مـوبرەم و حـەقن
بـــەڵام تـەقسیمی قــەزای غــەیبییە
بـۆ ئـەم دوو قـیسمە مـەنشەئێ هـەیە

❊ ❊ ❊

وەهایان دانا بـە گـوێرەی ئـەسباب
دوو بەشە قەزای حاکمی وەهھاب
یەکـەم: مـوبرەمە، یـانێ ئـەو قـەزا
بـــێ‌ســـوودە لەوا هــاوار و نــزا
خێر و سەدەقە، دۆعا و دەوای عام
حەوڵ و تەقالای بیر و هۆش و فام
یـانێ ئـەگـەرچـی سـەبەبی هـەیە
پەیوەندی غەیری خودای تیا نـییە

❊ ❊ ❊

دووهــەم: مــوعەللەق بــە مــانا ئــەوە
بـــە حـــەوڵی ئـێمــە بـەسراوەتـەوە

یــــانیٚ کـــــردەوە و ڕەفـــتاری بـــەشەر
قـــەیدە بـــۆ قـــەزای خـــالقی ئـــەکـــبەر
وای بـــڕیـــار داوە بـــە تـــەقالای خـۆت
نـــــانێك و شـــــانیٚ پـــەیدا بـــبیٚ بـــۆت
دەس بـــبەی بــــۆ چـــەك یـــا لەبـــۆ دینار
یـــــا لەبــــۆ دەرمـــــان یـــا تکـــای ڕوودار
یا بە هـــۆی خـــێرات یـــا دۆعـــای پـــاکـــان
یـــانیٚ هـــیممەتی دەروون ڕوونـــاکـــان
قـــەزای حـــەق وایـــە و وای بـــڕیـــار داوە
مــــەینەت بـــــەمانە بـــــڕواتـــە دوواوە
یـــــا قـــــەزای وایــــــە غـــافڵ دانـــیشی
تـــا بـــاری دوژمـــن بـــە شـــان بکـــێشـــی
ئـــێمـــە بـــیٚ ئـــاگـــاین لە ســـیڕڕی قـــەزا
بـــەڵام هـــوشیارین بـــۆ شـــەرت و جـــەزا
بـــــەبیری خـــــۆمـــان ئـــەکـــەوینە دەو
بـــەدوای مـــەقسوودا بـــە ڕۆژ و بـــە شـــەو
لەم ئـــــەنجامەدا دەر ئـــــەچیٚ بـــۆمـــان
چـــۆن بـــووە قـــەزای خـــودا لەســـەرمان
یانیٚ مەشرووت و قەید و شـــەرتەکـــەی
داخـــــڵی قـــــەزان لەســــەر زەبـــتەکـــەی
ئـــەمیان مـــۆڵەقـــە و ئـــەویان مـــوبرەمە
ئـــەم بـــاسە بە عـــەقڵ زۆر مـــوسەللەمە

بــە کــورتی «مــبرم» حــوکمێکــی وایــە
بــەس ئــیجادی حــەق لەو ئیشەدایـە
یــــانێ ســــەبەبی عـــادەتی نـــییە
یـــان کــەسبی ئـێمــە عـیللەتی نـییە
یـــا کــەسبی ئـێمــە لەوا بــێ سـوودە
چوون ئەو قەزایە لای حەق مەقسوودە
«مـــعلّق» مـــانای شـــتێکـــی وایــە
عــەلاقەی کــەسبی ئـێمـەی تـێدایـە
وای بــڕیــار داوە بــە کــەسبی خـۆمـان
بــوون و نـەبوونی دەربـچێ بـۆمـان
خــۆیشــی ئــەزانــێ کـام لایان ئـەبێ
چــوون خــۆی عــالمە بـبێ یـا نـەبێ
نیسبەت بـەم عـیلمە ئـەحکام مـوبرەمە
لەمــــــە زیــــــاتر «الله اعـــــلم»ە

❊ ❊ ❊

دەفــتەری «لوح المــحفوظ»ی خـودا
دەفـــتەرە لەبـــۆ هــــەموو مـــاسیوا
تیا هەیە «تـنجیز»، تـیا هـەیە «تـعلیق»
تیا هەیە شەرت و سەبەب بۆ تـەوفیق
لەســـەر «مـــا فِـــي اللَّــوحِ مُـعَلَّق بِــهْ»
هـاتەجێ مـەشرووت ئـەبێ. «فَانتَبِهْ»

کــە نــەبوو نـابێ، خـۆیشـی ئـەزانـێ
کـام لا ئـێتـە جـێ لە ڕووی جـیهانێ
چونکی عیلمی حەق یا «امّ الکـتاب»
بــــڕیـــــویەتەوە ئــــاخری حـــیساب
«یَــمْحُو وَ یَـثبت» «لوح المـحفوظ»ە
«امّ الکتاب»یش قەتعی و «مـلحوظ»ە
چــونکی خـودا خـۆی ئـەسبابی دانـا
قــەت غــافڵ مــەبە بــەقەی تــەوانـا
بێ‌گـومان ڕاستە لەلای «مَـنْ وَعـیٰ»
﴿لَــيْسَ لِــلْإِنْسَانِ إِلَّا مَــا سَــعىٰ﴾

❊ ❊ ❊

# لە مانای ڕۆح و نەفس

**پرسیاری هەژدەهەم:**

مامۆستای بەرزم، ئیشکالێ ماوە
دڵ لەبۆ حەللی بە جۆش و تاوە

نەفس و ڕۆح و دڵ ناویان ئەبرێ
لەگەڵ عەقڵدا تەفسیریان ئەکرێ

بۆم بەیان بکە مەعنای ئەمانە
تا بۆم دەرکەون بەو تەفسیرانە

عەلاوەی ئەمەیش ئینسان ئەزانێ
خێر و شەڕ چییە لە ڕووی جیهانێ

کە خراپەی کرد بۆ هەرخۆی نییە
ئەڵێن شەیتان و نەفسی «دَنِی»یە

**وەڵام:**

نووری چاوانم، ئینسان دیارە
بە شکڵ و شێوە و باڵا و قەوارە

پێست و گۆشت و ڕەگ، ئێسکی جوانە
بەڵام بۆ هەموو گیانلەبەرانە

هەروا حەواسی «خَمسە» دیارن
لە حەیواناتا خاوەن ئاسارن

«فارِق» هەر عەقڵە، هەیە بۆ ئینسان
نەك بۆ حەیوانات، لەسەر ڕووی جیهان
مەبەس لەم عەقڵە عەقڵێکی وایە
هۆی «تطوّر»ە لەم ڕووی دونیایە
عەقڵیش سیفەتی نەفسی ئنسانە
پایەی کەماڵ و مایەی نوقسانە
هەر بەم عەقڵەیە دەرکی «کلّیّات»
«تطوّر» کردن لە ڕووی سەربیسات
نەفسی ئینسانیش لەگەڵ ڕۆح و دڵ
«غەزالی» ئەڵێت: یەکن «بِالحاصِل»
چونکی مانای دڵ ئەم مادە نییە
هۆی جووڵەی خوێن و «نَبض»ی «عُضو»یە
حەقیقەتێکە عەلاقەی هەیە
لەگەڵ ئەو مادە سنەوبەرییە
«إِذا صَلُحَتْ صَلُحَ الْجَسَدُ
إِذا فَسَدَتْ فَسَدَ الْجَسَدُ»[1]
کەشفی حەقیقەی ڕۆح و نەفس و دڵ
﴿قُلِ الرُّوحُ﴾ ئەڵێ موشکلە، موشکڵ
کە زانیت هەموو یەکن بە مانا
ئەمەیش بزانە ئەی برای زانا

١. بەشێکە لە فەرموودەیەکی پیرۆزی حەزرەتﷺ، واتە: ئاگادار بن لەناو لاشەی مرۆڤدا پارچە گۆشتێك هەیە، ئەگەر باش بوو، هەموو ئەندامەکانی تری باش ئەبێ، ئەگەر خراپیش بوو؛ هەموو ئەندامەکانی خراپ ئەبێت، ئەو پارچە گۆشتە دڵی مرۆڤە.

هـێزێکـی تـیایە لەبـۆ خـێر و شـەڕ
ئـەبێ بـە مـایەی کـردەوەی بـەشەر
ڕووی کردە چاکـە بـە «روح» نـاوئەبرێ
بـۆ بـەدی بـە «نـفس» لە قـەڵەم ئـەدرێ
یـانێ نـەفس و ڕۆح زاتـیان تـەنیایە
بـەهۆی ئـیشەوە نـاویان جـیایە
هۆی شەڕ گەلێکن: «خارج» و «داخل»
ئینسان بانگ ئەکـەن بـۆ کـاری «باطل»
خـارج بـەشەر بـوو شـەیتانی ئینسە
هـێزی پـەنهان بـوو شـەیتانی پـیسە
شەیتان هەرچۆنی تـەفسیر بـۆ بکـەی...
هـەیە، ئـەگـەر تـۆ لە حـەق لانـەدەی
ئـەم نـهێنـییە نـاوی شـەیتانە
«عَـدو»ی ئـینسانە و نـەسسی قـورئانە
«ذُرِّیَّـــــە»ی زۆرن، وان لە عـــالەما
ئـیش ئـەکـەن لەگـەڵ دڵی ئـادەما
بـەڵام خـۆ شـەیتان پـاشای تـۆ نـییە
تـۆ بـەگـوێی نـەکـەی قـیمەتی چـییە!
هـەر نـەفسی خـۆتـە بـە تـانووکە و دەو
وەکـوو دز دەسـەك مـوتیعە بـۆ ئـەو
ئەگەر بە مەردی بووی بە عەبدی خـوا
«سـلطە»ی نـامێنێ شـەیتان بـەسەرتا

بـــە یـــادی خـــودا دائــەمەزرێ دڵ

بـۆ نـووری خـودا ئــەبێ بـە مــەنزڵ

بـە خـۆپـەرستی لێت ئـەبێ بـە خـان

ئــەبێ بـە «مأویٰ» بـۆ سـوپای شـەیتان

ئـــەو لەو دونـــیادا بــەبێ تــەحاشا[1]

لە بـــرایـــی تــۆ ئــەڵێ ســەد حــاشا

بــەر لە حــاشای ئــەو تــۆ حـاشا بکـە

ڕێگــــەی ڕزگـــاریت تـــەماشا بکـــە

ئــەوانـە ڕێگـەی ڕەزای حـەق ئـەگـرن

بـە مـەردی ئـەژین، بـە مـەردی ئـەمرن

هــەرچــۆنـیش بـمرن زیـندوو ئـەبنەوە

بـــە نـــەسیمی حـــەق ئــەشنێنــەوە

ڕجـــامان وایـــە لە خـــودای کـــەریم

بگــەینە لای حــەق بـە قـەلبی سـەلیم

❊ ❊ ❊

---

١. دوور کەوتنەوە، خۆ لادان.

# پرسیار و ئازاری گۆڕ پاش مردن

**پرسیاری نۆزدەهەم:**

مامۆستای فەردم، بۆ تەعلیم کردن
مەشهووره سوئال لە دوای مـردن
ئینسان کە مرد و کەوتە ناو عەرزێ
لەپاش چەن ڕۆژێ لەشی دائەڕزێ
بەعزێ ون ئەبێ و لە قوولّی دەریا
بـازێ ئـەسووتێ و ئـەڕواتـە هـەوا
بە هەرحالّێ بێ بێ حیسس و فامە
لە بازێ شـوێنـا هـەم بـێ ئـەندامـە
دەی چۆن ئێتە جێ پـرسیارکـردن
یا خۆشـی و ئـازار لە دوای مـردن

**وەڵام:**

ڕۆڵەی شـیرینم، خـاوەن ڕۆحـی پـاك
بـاش ورد بـەرەوە بـە دڵێ ڕوونـاك
بۆت بەیان ئـەکـەم ئـەحواڵی مـردوو
لە مـاوای «بـرزخ» حـاڵی بـبە زوو
ئـەم ئـەحواڵانـە ڕاسـتە و بـێ عـەیبە
لە ئـەحواڵاتـی عـالەمی غـەیبە

یانێ بۆ ڕۆحە «حِسّ» و دەرك و فام
پێویستی نییە حەوواس و ئەندام
وەکوو فەرموویە شێخی غەزالی
بڕژێ بەسەریا نووری جەلالی
یەکێ نووستبێ بە خۆشی و ئارام
بەبێ تەکان و حەرەکەی ئەندام
تۆ هیچ نابینی لە ئاساری ئەو
لە شادی و خۆشی و لە ئازاری ئەو
«مع أنّه» ئەو خەو ئەبینێ
خودا چەن ئەحواڵ بە ئەو ئەنوێنێ
جارجار لەو خەوا لەلای عەشرەتە
مەشغووڵی شادی و زەوق و عوشرەتە
بازێ جار ڕۆحی دیلی حەسرەتە
گیرۆدەی جەفا و ئێش و زەحمەتە
هەرچەن ئەم حاڵە هەر لەبۆ گیانە
کەس وەرناگرێ لەوۆ نیشانە
هەروایە حاڵی مردوو پاش مردن
چ سەفا و جەفا، چ سوئال کردن
مادام ئینکاری خەوبینین ناکەی
بۆچی بۆ مردوو خۆت «مُنکِر» ئەکەی
عالەمی بەرزەخ عالەمی غەیبە
خەبەری ڕەهبەر ڕاستە و بێ عەیبە

# باسی مەعاد و زیندووبوونەوە

**پرسیاری بیستەم:**

ئوستادی زانای خۆش بیروباوەڕ

ڕەهنومای بەشەر بۆ دینی ئەنوەر

دەلیلی چییە فەوتانی جیهان؟

دونیایێ تازە خۆی ئەدا نیشان

بەشەر لەم عەرزا ئەمرن سەراسەر

زیندوو ئەبنەوە و ئەڕۆن بۆ مەحشەر

دونیا چی لێ دێ و مەحشەر کوێ ئەبێ

ڕووناکی عالەم لە چیوە ئەبێ

حیساب و میزان شێوەی چلۆنە

عەقڵم لەم باسا زۆر سەرنگوونە

یا پردی «صراط» بە بەیانێ خاس

باریکتر لە موو تیژتر لە ئەڵماس

چلۆن مەعقوولە ڕابوردن پیایا

عەقڵم حەیرانە لەم نەوعە ئەشیا

بۆم بەیان بکە لە ڕێی خودادا

با ڕێی حەق بگرم لەم ڕووی دونیادا

وەڵام:

نەسیمی سەفای ماوەی ژیانم
ڕۆڵەی عەزیزم، ئارامی گیانم
ڕاستن ئەمانە، دوورن لە خەیاڵ
لە خەیاڵی خاو، نەك خاوەن کەماڵ
یەکەم: مردنی گشت بەنیئادەم
دووهەم: وێرانی ئەم چەرخە سەرجەم
سێهەم: ئادەمی زیندوو ببنەوە
لە دادگادا گرد بکرێنەوە
چوارەم: حیساب و کێشی کردەوە
پێنجەم: هاتووچو بەسەر پردەوە
بەڵام ئەمانە لای تۆ گرانن
لای هێزی خودا سەهل و ئاسانن

* * *

بە چاو ئەبینین بەبێ ئیشتیبا
دەزگا و مەکینەی بەرقی کارەبا
بە تەنیا دەستێ لە مەرکەز بدرێ
هەزاران شوێنی پێ ڕووناك ئەکرێ
بە دەستێکی تر ئەکوژێنەوە
مەگەر جارێ تر هەڵکرێنەوە
هەم لەمەلایشەوە ئەزانین هەوا
مایەی ژیانە «تَنَفُّس» لەوا

شـــەپۆلی هـــەوایش ڕامـــی خـــودایـــە
هـــات و نـــەهاتی لەلای ئـــەوایـــە،
دەی زۆر قـــابیلە خـــەللاقی عـــالەم
ســـەعاتێ هـــەوا بگـــرێ لە ئـــادەم!
بـــــيانمرێنـــێ بـــە تـــەنيا ئـــانێ
ئـــەم دونـــيا بكـــا بـــە بـــيابانێ
یـــا جـــارێ هـــەوا تـێكـەڵ بـێ بـە غـاز
دونـــــيا بگـــۆڕێ نشـــێو و فـــەراز
یـــا مـــەرۆ بـــۆ غـــاز، هـــەرپایەی گـــەرما
لە ســـەد دەربـــچێ یـــا پـــایەی ســـەرما
لەم كـــــاتانەدا هـــــەموو گـــیانلەبەر
ئـــەمرن لە عـــەرزا، نـــەك تـــەنيا بـەشەر
تـــۆ ســـاغیت ئـــەوێ بـــە شـێوەی ڕاســـی
گـــوێ بگـــرە لە مـــن ئـــەگـــەر حـــەقناسی
مـــادام وای لـێهـــات ســـەنعەتی بـــەشەر
بـــە ئـــانێ شـــارێ ئـــەخاتە خـــەتەر
خـــۆیشت ئـــەزانـــی دامـــاوی ئـــینسان
«ظـــاهِر» و «بـــاطِن» پـــڕە لە نـــوقسان
حەق نییە قەتعەن وەســوەسە و خـەیاڵ
لە حاسی[1] هێزی خودای «ذِي الجلال»

١. حاست، بەرانبەر.

قــــیمەتی نــــییە بــە قــەدەر مــوویێ
کـــە بـــەنی‌ئادەم بـمرن بــە فــوویێ

❊ ❊ ❊

هــەروەها ئــافاق هــەموو مــومکینات
کـان و گـیا و دار لەسـەر ڕووی بـیسات
بـیر بکـەیتەوە بـە هـۆی بـەسیرەت
تـاقێقـیێ بکـەی بـە پـاکی سیرەت
بۆت دەرئەکەوێ بە ڕووی حـەقیقەت
«ضِعف»ی مومکینات لەسەر تـەبیعەت
تـێ‌ئـەگـەی عـالەم خـاوەن ئیمکانە
بـوون و نـەبوونی بـە حـەق یـەکسانە
هەرچی مومکین بـێ بـوون و نـەبوونی
زات و سـیفەتی، یـا چـەند و چـوونی
گـــەلێ ئـاسانە بـــە هــێزی قــودرەت
نـــەمانی زاتـــی یـــا فــەنای سـیفەت
مــــەسەلا سـەهلە بـەهۆی تـەکـانێ
ژێرەوژوور بـــبێ کـــەون و مـەکـانێ
نــــابینی جـــارێ بـــە بـــومەلەرزە
ژێرەوژوور ئـــەبێ ئـەم کـێو و عــەرزە
هــەر وایــە هــەموو مــاددەی ئاسمان
ئـەشێ بــۆ فـەنا، بـێ‌شوبهە و گـومان

بــــڕوانـــە هــێزی زەڕڕەی نــەوەوی[1]
چۆن ئـەسووتێنـێ تـەختی سـەرزەوی
هــــێزێ لەو هـــێزە بکـــەوێتـە کـار
عــــەلاوەی بــــبێ نــیسبەتی مــیلیار
ئـەوجار ئـەزانــی چـۆن وێران ئـەبێ
جــیهان بــە جۆرێ دڵ حـەیران ئـەبێ
بـەبێ مـاتاڵ بـوون لە بـەرد و لە غـار
کـۆسـاران ئـەکـا بـە گـەرد و غـوبار
لەمـــە قـــیاس‌کە بـۆ کـاتی تـەبدیل
تـەئسیری نـەفخی سووری ئیسڕافـیل
هـــێزێکــــی وەهـــای تـــیا دانــراوە
وەکـــوو لە دیـــنا بـــەیان کـــراوە
بـاش وێران ئـەکـا ئـەم دونـیا هـەموو
کـێو شـی ئـەکـاتۆ بـە وێنـەی پـەموو
«فَـــــیَذَرُها قــــاعاً صَــــفْصَفاً»[2]
ڕوونـــاکـــە و ســـافە لەلای «عُــرَفا»



زیندوو بوونەوەی گەلی مردووان تەماشا بکە بـە چـاوێکـی جـوان
چــۆن تـۆمــی گـیا ئـەڕوێتـەوە گیا وەکـوو جاران ئـەبووژێتـەوە
بـاغچە و بـێستانان ئـەشنێتـەوە گوڵ وەکوو ساڵان ئەگەشێتـەوە

---

١. نەوەوی: ناوکی، هەستەیی، ئەتۆمی.
٢. شوێنەکانیان ئەهێڵێتەوە و ئەیانکا بە دەشتێکی ساف.

وەکوو ئەبینی بازێ تۆمی عەرز — فەرقیان هەیە بۆ ڕووان سەد تەرز
هیچ مانیع نییە ماددەییێکی وا — ببێ لە لەشی بەنیئادەمدا
ببێ بە ئەساس بۆ «نَشأ» و نما — قەبووڵی بکەن گەلی عولەما
وەکوو سابتە بەشێوەی تاقیق — ماددەییێ هەیە زۆر ورد و دەقیق
لە خوار پشتەوە بە زمانی عەرەب — ناوی براوە بە «**عُجْبُ الذَّنَب**»
ڕۆژیئاخیرەتپێشوادەیمەحشەر — ئەبێ بە ئەساس بۆ نمای بەشەر
دوور نییە لە فام بە عەقڵی ئینسان — نەبێ بە مەورد بۆ مەحوو فەوتان
هەتا ئەوکاتە کە خودای عالەم — زیندوو ئەکاتۆ گشت بەنیئادەم

❊ ❊ ❊

﴿**يَبْدَأُ الْخَلْقَ ثُمَّ يُعِيدُهُ**﴾

«**قَرَأْنَا الدَّرْسَ ثُمَّ نُعِيدُهُ**»

ئیجادی یەکەم بە تۆمی بابە
دووهەم بەم مادده بۆچی خراپە؟!
ئەو هێزی خەلقە وا لەناو تۆما
بمێنێتەوە لەلەشی خۆما
ئەگەر ئەو مادده فەوتا بە جارێ
خاوەنی ماوە بۆ کاروبارێ
بە هێزی خۆی بوو کە پەروەردە بوو
بەس خاوەن باغچە لە پشت پەردە بوو
خۆی دەرئەخاتۆ و جیلوە ئەنوێنێ
بە قالبێ تر بەشەر دەرئێنێ

﴿يُحْيِيهَا الَّذِي قَدْ أَنْشَأَهَا
أَوَّلَ مَرَّةٍ﴾ «وَ منشأها»[١]

«يَجمَعُ الْأَجْزَاءَ أَوْ بِمِثْلِهَا
كُلُّ مَسند إلىٰ أَصْلِهَا»[٢]

لەپاش ئەم ئینشا کە خۆیان ناسی
ڕەوایە بڕۆن لەسەر ڕێی ڕاسی
بڕۆن بۆ دەرگای دادگای عالەم
جێی بەرز و نزمی مەرتەبەی ئادەم
زیندوو بوونەوەی گشت ئادەمیزاد
لە عورفی دینا پێی ئەڵێن «مَعاد»
یانێ مەعادی جیسمانی عەیان
وەکوو چۆن ئەژیا لە یەکەم جیهان
لەسەر زاهیری بەعزێ لە ئایات
بە جەمعی ئەجزا ئێتەوە حەیات
لەسەر بەعزێکیش بە خەلقی وێنە
هەردوو ڕووناکن وێنەی ئاوێنە

* * *

سەرگەردان مەبە لە جەمعی ئەجزا
کە بوون بە خاك و چوون بە عەرزا

---

١. ئەو کەسە زیندووی ئەکاتەوە کە یەکەمجار خۆیشی و بنچینەکەشی دروست کردووە کە خوایە.

٢. هەموو پارچەکانی لەش وەك خۆی یا وێنەی ئەوان کۆ دەکاتەوە، هەرکام لەو دوو قسە (بیرورا) پاڵدراوە لە بنچینە و بەڵگە کە لێی وەرگیراوە.

یـاخود بـە ئـاگـر هـەموو سووتاوە
یـــاخود لە ئـاوا مـاددەی فـەوتاوە
چونکی ئەو ئەجزا مەشموولی عیلمن
هـەموو تـەسخیری نـفووزی حـوکمن
بـە قـودرەتی خـۆی خـالیقی عـەللام
گرد ئەکاتەوە گشت ئـەجزای ئـەندام
ڕێك ئەکـەونەوە بـۆ نـەشئەی «ثـانی»
بـــۆیـان دێتـەوە ڕۆحـی ئـینسانی

❊ ❊ ❊

بە خەلقی وێنەیش ئـەکـەین ئـیعتیراف
چـــونکی نـابینین غـوباری خـیلاف
ئـــایەی لاپـەڕەی ئـاخری «یـاسین»
چـرای خـودایـە لەبـۆ حـەق نـاسین
خـــەللاقی عـەلیم بـە حـەق دانـایە
بـۆ خـەلقی «امـثال» بـاش تـەوانـایە
هـیچ عـەیبی نـییە لە وێنـەی ئـەجزا
دروست کـــاتەوە قـــامەت و بـــاڵا
مـەربووت بێتـەوە بـە عـەینی نـەفسی
کـــە مـــاوەتەوە لە غـەیبی قـودسی
نـــوقسانی نـییە بـۆ ڕۆژی حـیساب
بـۆ تـۆڵە و جـەزا، سـەواب و عـیقاب

چونکی موعتەبەر نەفسی ئینسانە
ئەوە مەوردی قەهر و ئیحسانە
تۆ کە قەرزاربی کاتی منداڵی
عومریشت بگا بە حەفتاساڵی
بەپێی سەنەد و ئەوراقی ڕاسی
قەرز ئەدەیتەوە ئەگەر حەقناسی
دادگا ناڵێ ئەوسا مناڵ بوو
بەدەنی ساغ و نەوسونع و ساڵ بوو
ئێستە داماوە و زەعیف و پیرە
داوای ئەو قەرزە غەدر و تەقسیرە
هەروایە حوکمی بەشەر لە مەحشەر
ئەگەر بگۆڕێ شێوەی ڕووی بەشەر
یاخود ئەو ئەجزای قەدیم نەمێنێ
بە ئەجزایێ نۆ خودا بینوێنێ
نابێ بە مانیع بۆ تۆڵەی کردار
لای ئەهلی عەقڵ و شوعوور و «ابصار»
کە ئەم مەتڵەبە لەلات مەعلووم بوو
بە میسکی ئەزفەر باسی مەختووم بوو

❊ ❊ ❊

بڕوانە لەبۆ حیکمەتی «معاد»
زیندووو بوونەوە بۆ ئادەمیزاد

ئینسان لەم ژیناکە خاوەن فام بوو
جێگەی تەکلیفی خودای عەللام بوو
ئەبێ ڕۆژێکی وەهایش ببینێ
تۆڵەی کردەوەی تیادا بسێنێ
بە چاو ئەبینی و بە دڵ ئەزانی
کردەوەی نەفسی و ماددی ئینسانی
یەکێ ئەبینی کردەوەی پاکە
ڕەوشتی بەرزە و ئەخلاقی چاکە
بە پایە و بە ماڵ، بە زمان و قەڵەم
هەر خزمەت ئەکا بۆ بەنیئادەم
بەڵکوو بە وێنەی قۆچی قوربانی
خۆی فیدا ئەکا لە ڕێی حەقزانی
سوودی بۆ عالەم ئەوەندە زۆرە
پڕتەوی وێنەی پڕتەوی خۆرە
لە هەر شوێنێکا شۆڵەی دەرکەوێ
تاریکی دڵان نامێنێ لەوێ
بە سوورەت بەشەر، سیرەت فریشتە
جیهان بەمانە وێنەی بەهەشتە

* * *

هەروا ئەبینی سینفێکی سەرخۆش
بە دڵ و دەروون ناساغ و نەخۆش

بـە خـۆپـەرستی هـەیکەڵ پـەرستە
لە سوودی عالەم بێهـۆش و مـەستە
ئەیەوێ جـیهان بـۆی بـبێ بـە جام
هەر خۆی تێدا بێ بە تـوولی ئـەییام
دەس‌بەردار نـابێ بـەم حـاڵە پـەستە
ئـــازاری خـــەڵکـــی لەلا مـــەبەستە
بـێ داد و نـامەرد، بـێ مـیهرەبانی
وەکـــوو دوڕەنـــدەی کـاتی گـرانـی
خوێن ئەرژێنێ لەسەر ڕووی زەمـین
کـــەس لەدەســتیا نـــاژی بـە ئـەمین
دەست درێژ ئەکا بۆ ماڵ و ناموس
لەپاش فـەوتانی «ارواح» و «نـفوس»
نە دینی هەیە، نە فـام، نـە ویـجدان
نــە شـــەرمی هـــەیە لە ڕۆژی تـاوان
بە کورتی ئەوەی دوورە لە شـوعوور
ئـــایینی ئـــەوە بـــۆ نـــزیك و دوور
بەم حاڵە ئەژی نـزیکەی سـەد سـاڵ
ساڵ لە ساڵ بەدتر بـۆ ئـیشی بـەتاڵ

❊ ❊ ❊

دەی چۆن ئەو کەسەی کە خاوەن فام بێ
خـــاوەن ویـــجدان و هـۆشـی تـەمام بـێ

قـــەناعەت ئـــەکـا ئـەم دوو ئـینسانە
ئـەو بـەو کـەماڵە و ئـەم بـەم نـوقسانە
هـــەروەها بـــمرن دەرچـــن لە دونـیا
عـــالەمێ نـــەبێ بـــۆ تـــۆڵە و جـەزا
ئـایەی ﴿أَمْ حَسِبَ﴾ بـیست و یـەکـەمین
لە «جـــاثیە»دا دڵ ئـــەکـــا تـــەئمین
کــە هــاوشان نـابن ئـەم دوو ئـینسانە
شـــانی ئـەو سـوودە و ئـەمیان زیـانە
کـەوابـێ فـەرزە بـە عـەقڵ و ویـجدان
عـــەلاوەی ئـــایەی عـــالیەی قـورئان
هـــــەردوو حـــازر بـــن لە دادگـــادا
لەنـــاو کـــۆمـــەڵی بـەندەی خـودادا
ئـــەویان بگـــاتە پـــایەی دڵبـــەندی
بـە خـۆشەویستی و بە ئـەرجومەندی
سـەربەرزی ئـەبەد وەربگـرێ بـۆ خـۆی
پـــایەی کـەڕامـەت دەرکـەوێ لەبـۆی
ئـــەمیان دانـــەوێ بـۆ پـایەی نـەوی
دەرەکـــی ئـــەسفەل، لە چـــاڵی زەوی
شـــــەرمەسار بـــبێ لەنـــاو عـــالەما
لای خـــــودا و لەلای بـــــەنی ئادەما
لەسەر ئەندیشە و پیشەی ڕووی جیهان
وەربگـرن تـۆڵەی خـۆیـان بـە عـەیان

قـــیمەتی چـیـیە کـە کـەس نـەیزانــی
تـــــۆڵەی ئـــەمانە لەبـــەر پـــەنهانی
یـــــانێ مـــەعادی ڕۆحـــانی تـــەنیا
پـێـی دەرنـاکـەوێ سـوورەتی ئـەشیا
ئـــەوەیە دەردی خـــاوەن تـــاوانـــان
کـــە ڕیســـوا بـــبن لەنـاو هـاوسەران
ئـــەمەیە بـەرزی بـۆ خـاوەن ئـیحسان
پـــایەی دەرکـەوێ بـۆ گـەلی ئـینسان
یـــانێ مـــەعادی ڕۆحـــی و جســـمانی
یـــانی هـــەیکەڵی شـەخسی ئـینسانی
بـــێتـــە بـــەردەرگای دادگـــای خـودا
خـــیتابی خـــودا بـێ بـەسەر ئـەودا
بـــزانـــێ کـــابرا چ کـــەسە و کـێـیە
کردەوەی چۆن بوو، خەڵکی کام جێیە
ئـــیمڕۆ کـــام ڕۆژە واهـــاتە مـــەیدان
کـــەوتە مـــەیدانـــی دادگـــای یـەزدان
لەســـەر دەفـــتەر و نـــامەی کـــردەوە
باش بـۆی دەرکـەوێ هـەرچی کـردووە
وەربگـــرێ نـــامەی جـەزای ئـیلاهی
لەســـەر «اوامِـــر» لەســـەر «مَـــناهی»
یـــا ســـەر دابـــخا لە شـــەرمەساری
یـــا ســـەرفەراز بـێ لە تـۆڵەی کـاری

ڕەبـــبی بـە فـەزڵی پـایەداری خـۆت
بـە فـەیزی قـودسی بـەرقەراری خـۆت
بـە تکـای پـەنای مـەیدانـی مـەحشەر
یـانێ «مـوحەممەد» ڕەهـبەری بـەشەر
ســەرفەرازمــان کـــەی لە «دارالبـقا»
شـــادمانمان کـــەی بـە نـووری لەقـا
تـــاله فـــیردەوسی ئـــیحسانی عـــاما
بـــــژین لە پـــەنای «خـــیر الانـــام»!

* * *

«مُـــخبِر»ی سـادق وەك هـەتاوی ڕۆژ
پـێی نـیشان داویـن وەزعـی پاشەڕۆژ
ئـــادەمی ئـەمرێ، ڕۆحـی ئـەمێنـێ
خۆشی و ناخۆشی خوا پێی ئـەنوێنـێ
جـیهان سـاف ئـەبێ لە بـەرز و نـەوی
بـەسەریا بـڕۆی پـێی هـەڵناکـەوی
فـــەڵەك بـەراسـتی دەوری نـامێنـێ
نـە ڕۆژ و نـە مـانگ، هـەتاو نـانوێنـێ
بـە نـووری قـودرەت وەکـوو بـەربەیان
ڕوون ئـــەبێتـەوە عـالەم بـۆ ئـینسان
کـۆمـەڵگـای ئـادەم خـودا ئـەیزانـێ
ئەم حەشر و نەشرە هـەر ئـەو ئـەتوانـێ

مـــیزانـــی عــەمەڵ، حـیساباتی عــام
حــەواڵەی بکــە بــە خــودای عــەللام
ئێمە مـەئموور نـین بـە تـەفسیلی حـاڵ
بۆچـی ڕوو بکـەین لە گـرێ و ئـیشکاڵ
بەهەشت و دۆزەخ ئێسـتە مـەوجوودن
بۆ ئەهلی خۆیـان بـە چـاو مـەشهوودن
لەلای عیلمی خـوا عـەرز و سـەماوات
بــەهەشت و دۆزەخ، بـاقی کـائینات
وەکــوو نــمێکــە لە دەریـای بـێ پـەی
«لَــــمْ يَــــحُطْ بِــــهٰا اِلَّا اللهُ الْـــحَيّ»
«قَـــطْرَةٌ مِـــــنْهٰا ضٰـــــارَتْ دَلیـــلاً
وَ مٰـــــــا أُوتـــــیتُمْ إِلّا قَــــلیلاً»
هەرچی مومیکن بێ بە عـەقڵی بـەشەر
قـــابیلە بــــبێ و بـــیبینێ «بَـــصَر»
«یَـــــوْمَ تَشْـــــهَدُ عَــــلَیْهِمْ لَــــهُمْ
أَیْـــــدِي الْــــعِبٰادِ وَ أَرْجُــــلُهُمْ»
هەرچەن دەس نـادا بـۆت بکـەم بـەیان
وێنەی دەس‌مۆری سەرپەنجەی ئینسان
«أَنْـــطَقَنَا اللّـــه» بـۆت بـەیان ئـەکـا
غــەیری عــادەتت بــۆ عــەیان ئـەکـا
مــیزانــی وەزنــی کـردەوەی ئـینسان
هــەیە لە ئـایەی مـەنسووسی قـورئان

عوبووری سەر پرد، ئەگەرچی بۆمان...
گران ئەنوێنێ بە یاسای زەمان
بەڵام ئەو ڕۆژە ڕۆژی قودرەتە
عالەم بە قودرەت خاوەن سوورەتە
وێنەی ئەمانە دەرکەوتن بۆمان
سەیارەی سەرتەل لە ڕووی ئاسمان
میزانی «ضغط»ی[1] خوێنی ئادەمی
میزانی ئەنوای جەووی عالەمی
میزانی گەرما و سەرمای سەرزەوی
میزانی بەرزی و پەستی جێی نەوی
ئەگەر نەتەدی ئەسبابی ئەمڕۆ
چۆن حاڵی ئەبووی هەر بە گفتوگۆ
«مع أنّه» ئەخباری حەزرەت
بەقەی ئەفهامە بۆ عەقڵی ئوممەت
باش ئیقرار بکە بە فیکر و تەدبیر
بلێ: «آمَنْتُ بِاللهِ الْقَدِيرِ»
زۆر چاکی فەرموو شێخی مەولەوی
ڕەحمەت لە ڕۆحی پاکی مەعنەوی:
«گەر زەڕڕەیە شعوور هەیە پێتەوە
کە وتیان خودا، ئەبڕیێتەوە»
«نَسْئَلُ الْمَوْلىٰ حُسْنَ الْخِتَامِ
بِحَمْدِ اللهِ مَعَ السَّلَامِ»

---

١. فشاری خوێن.

# ئایا کاری کەسێ بۆ کەسێکی تر بەسوودە؟

**پرسیاری بیست و یەکەم:**

مامۆستای دەرزی موشکلاتی دین
ڕەهنومای حەیران بۆ ڕێگەی یەقین
گەلێ ئایاتی کەریمەی قورئان
بۆمان دەرئەخەن بێ شوبهە و گومان
ئینسان مەڕهوونە بە کردەوەی خۆی
کاری یەکێ‌تر سوودی نییە بۆی
﴿يَوْمَ لَا تَجْزِي نَفْسٌ عَنْ نَفْسٍ﴾
وێنەی بورهانە بۆ نەفسی قودسی
﴿لَيْسَ لِلْإِنْسَانِ إِلَّا مَا سَعَىٰ﴾
بورهانە و مایەی یەقینە «قَطعًا»
کەوابێ ئەبێ سوودی کامە بێ
خێرێ لە غەیرێ جێبەجێ ببێ
یاخود کامەیە دەلیل و حوجەت
لەسەر مونکیری بابی شەفاعەت

**وەڵام:**

جگەرگۆشەکەم، هێزی ئەژنۆی دڵ
بە ئەوهامی خۆت قەت مەبە ماتڵ

لەسەر ڕووناکی ئایات و ئەخبار
لەسەر دوو بەشە یاسای کردگار
یەکەمین عەدڵە ڕووبەڕووی ئینسان
بۆ تۆڵەی عەمەڵ بێ کەمی و نوقسان
دووهەمین فەزڵە و مەحزی ئیحسانە
مایەی پیرۆزی نەوعی ئینسانە
﴿يَوْمَ لَا تَجْزِي نَفْسٌ عَنْ نَفْسٍ﴾
بە یاسای عەدڵە بۆ تۆڵەی شەخسی
هەروەها ئایەی ﴿لَيْسَ لِلْإِنْسَان﴾
وێنەی ئەمانەیش بزانە یەکسان
«مُستثنیٰ»کانی حەدیس کە «نصّ»ن
هەموو بە وێنەی کردەوەی شەخسن
یانێ بە یاسای عەدڵی ئیلاهی
لە «دار القَضا»ی **«لا مُتناهی»**
بەپێی ڕەفتار و کردەوەی بەشەر
جەزا دائەنرێ بە سوود و زەرەر
بە یاسای دووەم یانێ فەزڵی خوا
تەنیا کردەوە نییە لە ناوا
قاپی مەرحەمەت گەلێ گوشادە
دڵی موسوڵمان بەو ڕەحمە شادە
دوعای ڕەهبەران لەبۆ دەستەیان
بۆ چاری دەردی دڵی خەستەیان

دوعای لێ‌خۆش بوون لە موسوڵمانان
ئەی خوێنیتەوە لە ئایەی قورئان
﴿وَاتَّبَعتهُمْ ذُرِّيَّاتُهُمْ﴾
بخوێنە و بڵێ: ﴿فَطُوبىٰ لَهُمْ﴾
یا ئەو خێراتە بە ئەمری حەزرەت
بەجێیان هێنا بە حوسنی نییەت
وەکوو وەقفی ماڵ یا قەزای ڕۆژوو
یا حەج بۆ شەخسی لە قووەت کەوتوو
هەموو ئەمانە لە بەشی فەزڵە
دەرکی ئەم فەزڵە بۆ عاقڵ سەهلە
هەروەها باقی خێری موحسینین
لەبۆ مردوویان لەسەر ڕێگەی دین
مەسەل بیستووتە حەدیسی حەزرەت
لە باسی تۆڵەی کردەوەی ئوممەت
دانەی حەوگوڵەی حەوسەد دانە بار
لە قورئانایە، بینیوتە چەن جار
هەم تێیدا هەیە زیاتر لەمانە
هەمووی مەنسووسی ئایەی قورئانە

❋ ❋ ❋

# باسی شەفاعەت

باسی شـەفاعەت تکای پێغەمبەر
بـڕژێ بـەسەریا ڕەحـمەتی ئەکبەر
بە نەسسی ئایەت دەرئەکەوێ جوان
بە چەن «استثنا»ی مەنسووسی قورئان
﴿إِلَّا بِـــإِذْنِهِ﴾ لە ئـایەی کـورسی
﴿إِلَّا لِـــمَنِ ارْتَـــضَىٰ﴾ ئـەبیسی
ئـەگـەر نـەبوایـە ڕێگـەی شـەفاعەت
هەرگیز نەت‌ئەدی «استثنا»ی ئـایەت
حەدیسی حەزرەت بۆ ئەم خوسووسە
بە گەلێ تـەعبیر هـەیە و «منصوص»ە
عـەلاوەی ئـەمە، سیڕڕی شـەفاعەت
ڕوونـاکـە لەلای ئـەهلی مـەعریفەت
بە نەوعێ ئەهلی ویجدان و ئینساف
بـە تکـای ڕەهـبەر ئـەکـەن ئیعتیراف

❊ ❊ ❊

یەکەم: ڕەحمەتی خالیقی ئەکبەر        کە گوشادترە لە عـالەم یـەکسـەر
هەرئەوڕەحمەتەئێتەحەرەکەت[1]        دەروونی ڕەهبەر لەبۆ شەفاعەت
دووهەم: ئەمەیە دەرکەوێ عەیان        فەزڵی موحەممەدسەییدی‌ئەعیان

١. هەر بەو رەحمەتە، «نوسخە».

یانێ لەو ڕۆژا دونیا ئێتە جۆش
لە ترسی خودا ئەکەونە خرۆش
کەکەس ناوێرێ سەری خۆی دەرخا
بۆ تاوانباران تکایێ بکا
بەر لە ئەنبیا ئیزنی شەفاعەت
لەبۆ حەزرەت دێ بۆگەلی ئوممەت
سێهەم: دەرکەوێ فەزڵی ڕەهبەران
لەپاش پێغەمبەر لەسەر دیگەران
چوارەم: دەرکەوێ مەرتەبەی ئەبرار
بە تکا کردن لەبۆ تاوانبار
پێنجەم: هەرکەسێ خاوەن ئیمانە
شایاوی لوتف و فەیزی ئیحسانە
سابتە بۆمان بە «نصّ»ی ئەخبار
ڕۆژی قیامەت کە ئێت بە ئازار
عالەم دائەگرێ زەلزەلەی مەحشەر
پەرێشان ئەبن کۆمەڵی بەشەر
لە ترسا ئینسان سەرگەردان ئەبێ
بۆ ڕزگاری خۆی زۆر حەیران ئەبێ
ڕۆژی ڕۆشنیان لێ ئەبێ بە شەو
هەموو لە هەولا ئێنە تەکودەو
جاگەل گەل ئەڕۆن بۆلای ڕەهبەران
بۆلای «اولوالعزم» لە پێغەمبەران
هەریەکێ نەوعێ مەعزەرەت ئەکا
دووری لە وەزعی شەفاعەت ئەکا
تا لە ئەنجاما ئوممەت خاس و عام
ئەڕۆن بۆ قاپی «سیّد الانام»
کاتێ گەیشتن بە خاکوپای ئەو
ئێتە جۆش قەلبی بەرزی والای ئەو
سوجدەی بەندەیی ئەبا بۆ خودا
لەویا دەس ئەکا بە ڕجا و تکا
تا لای خوداوە ئیلهامی بۆ دێ
بۆ تکای ئوممەت ئیجازەی ئەدرێ

❊ ❊ ❊

ئەمجارە سەری بەرز ئەکاتەوە
پەردەی شەفاعەت لائەداتەوە
یەکەم: ڕاوەستان بېڕێتەوە
دەرگای حیسابات بکرێتەوە

دووهەم: بۆ ئەوە گەلێ لە پاکان
بێ حیساب بڕۆن بۆ ئەعلا مەکان
سێهەم: ڕزگاری گەلێ لە ئوممەت
کە تاوانبارن لە باری زەحمەت
چوارەم: بۆ ئەوە کە تەخفیف بدرێ
ئازاری گەلێ کە عەزاب ئەدرێ
پێنجەم: بۆ بەرزی پایەی شەرافەت
بۆ گەلی چاکان لە ڕیزی ئوممەت

❊ ❊ ❊

بەم «فتح الباب»ە ئەکەونە تەکان
گەلی ئەنبیا، هەم ئەولیاکان
یانێ کۆمەڵی ئەنبیای کیرام
ئال و یاران و شوهەدای ئیسلام
باقی ئەولیا و عولەمای ئەعلام
باقی چاکەکان، موتیعی ئەحکام
ئەکەونە تکا بۆ تاوانباران
جا ڕەحمەت ئەڕژێ بەوێنەی باران
سەیلی ئیحسانی خودای میهرەبان
ئەگا بە عالەم بێ حەدد و پایان
ئەوە لەم فەیزە دوورە و «مَنْسی»یە
مەوردی فەیزی زاتی قودسییە

وەکوو فەرموویە شێخی مەولەوی
بڕژێ بەسەریا فەیزی مەعنەوی
«کە دەسمان بڕا لە هەموو لایە
نەوبەی ڕەحمەتی حەق تەعالایە»
یا بە مەرحەمەت نەجاتی ئەدرێ
یا بە نەوعێ سووك عەزابی ئەدرێ
ئەمجار دەرئەچن لە عەزابی نار
ئەڕۆن بۆ بەهەشت بەوێنەی ئەبرار
لەوێ شاد ئەبن بە لیقای خودا
بە نووری سیمای چرای ئیهتیدا
ئومیدەوارین بە خودای عالەم
بە پایەی بەرزی ڕەهبەری ئەکرەم
لە لیوای ئەودا حەشرمان بکرێ
لە سایەی ئەودا جێمان پێ بدرێ
ئەمەیە یاسای نیزامی ئیسلام
ئینسان بترسێ لە خودای عەللام
ئومیدەواربێ بە فەیزی ڕەحمەت
بە عەفووی گوناه لە چارەی ئوممەت
دائیر بێ لەناو خەوف و ڕجادا
بۆلای «أمن» و «یأس» هەرگیز لانەدا
جا ئەگەر هەر هات بە تاوانباری
کەوتە تاریکی ڕێی شەرمەساری

ئومێدی نەبڕێ بەشێوەی بیدعەت
لەبارەی خێری پایەی شەفاعەت
ئیسلام نەیفەرموو بە ئەتباعی خۆی
تاوان تاو بدا تا ڕێکەوێ بۆی
بایی بێ بەهۆی تکای تکاکار
باری خۆی بکا لە باری ئەوزار
پشتێنەکەی خۆی لێ بکاتەوە
بەهۆی شەفاعەت لانەکاتەوە
«حاشا وکلّا» ئایینی ئیسلام
ترسە و تەمایە بە خودای عەللام

❊ ❊ ❊

نەوەك بەوێنەی «کَشیش»ی کەم فام
کە «عیسێ» ئەکا بە قوربانی عام
لای ئەو حەزرەتی عیسای «بن مریم»
خۆی کرد بە فیدیە بۆ بەنیئادەم
یانێ هەرکەسێ کە تاوانبار بێ
ئەگەر تاوانی هەتا میلیار بێ
کە ڕۆیشتە لای وەکیلانی باب
هەمووی ئەبەخشێ و نابینێ عەزاب
نازانێ ئەمە فکرێکە عەجەب
دوورە لە یاسای ئایین و ئەدەب

نـــە مـــوافـــيقى ديـــن و ئـايينە
نـە لەسـەر ياساى عـەقڵ و تـەمكينە
هەى واتە غەڵەت، هەى بـيرى بـەتاڵ
چەن دوورە لە ڕێى شـعوور و كـەماڵ
عـــاسى ڕابـــوێرێ لە مـــەڵهاى شـــارا
عـــيسا لەبـــۆ ئـــەو بكـــرێ بـــە دارا

❊ ❊ ❊

گـــەلى ڕەهـــبەران، ئـــەنبيا و «ڕُسْـــل»
هەموو هـاودينن بـێعـەيب و «عُـتُل»
لە ئـــەسڵى ديـــنا يـــەك ڕێيـــان هـەيە
ئـــيختيلاف لەويـــا بـــە قـــەتعى نـــييە
بـــەڵێ ئـــەحكامى فـــەرعى ڕەهـــبەران
گـــۆڕراوە بـــەپێى مـــەكـــان و زەمـــان
ئەسڵ و فەرعيان ڕووبەڕووى ئينسان
ئـــەمەيە فـــەرزە بـــۆ ئـــادەم ئـــيحسان
پـــێويســـتە دوور بـــێ لە تـــاوانـــبارى
دوور بـێ لە خـەتا و لە شـەرمەسارى
بـــترسێ بـــە دڵ لە خـــوداى عـــالەم
لە ڕۆژى حـــيساب بـــبێ خـــاترجـــەم
دووركـەوێتەوە لە فـەحش و مـونكەر
لە جـــەور و بـــێداد لەســـەر گـيانلەبەر

مســـــقاڵە زەڕڕە بـــــخوێنـــــێتـــــەوە
کـــە خـــودا تـــۆڵەی ئـــەسێنـــێتـــەوە
بـــــەڵام ئـــومێدی ئـــەمەیشی بـــبێ
خوداکـە خـواستی ڕەحـمەتی ئـەبێ
ئـــەتوانـــێ بـــە حـــەق ببـەخشێ تـاوان
یـــا بـــەهۆی تکـــای گـــەلی ڕەهـــبەران
جـا ئـەگـەر وابـوو فـەزڵ و ڕەحـمەتە
ئـــازاریش بـــدا عـــەدڵ و حـــیکمەتە
ئـــەمەیە دەرزی مـــامۆســـتای ئـایین
حـــەقپەرستانی کـــورەی ســـەرزەمین

❊ ❊ ❊

## ترس و هیوا (خوف و رجا)

**پرسیاری بیست و دوووهەم:**

مـــامۆســـتای زانـــای ئـــەسرای ئـــایین
راوەســـتاو لەســـەر نشـــینگەی تـــەمکین
خودای «ذی الاكرام» بە نەسسی ئایەت
وەعدەی جەزای دا بـە ئـەهلی تـاعەت
خودایش زۆر دوورە لە وەعدە خـیلاف
ئـــیتر پـــێم بـــڵێ بـــەشێوەی ئـــینساف
بـــۆچـــی ئـــەترسن مـــوسوڵمـــانەکـــان
لەپـــاش ئـــیتاعەی خـــودای لامـــەکـان

**وەڵام:**

«لُؤلُؤ»ی سـەدەف نـاو دەریـای ئـافاق
لالەی حـەدیقەی دەروونـی مـوشتاق
بـە دڵ گـوێ بگـرە لەم بـاسە خـۆشـە
شـــیفای ئـــازاری دڵەی نـــەخۆشـــە
لەبـۆ وەڵامـــی ئـەم بـاسە فـەرمووت
چەن نوکتە ئەڵێم ڕای بگرە بـۆ خـۆت
یـــەکـــەم: کـردەوە بـۆ لوتـف و جـەزا
بەهانەی ڕەحمن نەك بـەهای سـەودا

بە میلیارد میلیارد کردەوەی ئیحسان
ناگا بە شوکری نیعمەتی ئینسان
چ جایێ پایەی سەوابی عوقبا
سەفا و سەیرانی شەجەرەی «طوبیٰ»
یا ئاسایشی بەهەشتی فیردەوس
یا دەسکەوتنی «مٰا تَشتَهي النَّفس»[1]
یا نەبڕانەوە بۆ خۆشی و نیعمەت
بێ «معارضە»ی نەخۆشی و زەحمەت
بێجگە لە زیادەی دەرەجەی ئیقباڵ
یانێ دیتنی خودای «ذي‌الجلال»
مادام کە سەواب فەزڵ و ئیحسانە
نەك موقابیلی تاعەتەکانە
ئەبێ بترسێ هەرکەس ئینسانە
لە قەتعی خێری، مەحزی ئیحسانە

❋ ❋ ❋

دووهەم: با بڵێین کردەوەی ئینسان
عیللەتە لەبۆ جەزای «ذو الإحسان»
خۆ تۆ ئەزانی ئەم کردەوانە
هەموو گرەوی ئادابەکانە
تۆ چۆن ئەزانی ئەرکان و ئاداب
هەموو هاتە جێ بە یاسای حیساب

١. واتە: لە بەهەشتا هەیە ئەوەی نەفسی مرۆڤ ئارەزووی بکات.

یـــاخود کـــردەوە فـــەرعی نـــییەتە
یـــانێ بـــێ نـــییەت بـــێ‌مـــەزییەتە.
شـــەرتی نـــییەتیش ئـــەمەیە چـاك بـێ
لە تـــۆزی شـــوبهە و ڕەزیـلە پـاك بـێ
بـــەوێنـــەی عـــوجب و ڕەزیـلەی ڕیـا
یا باقی وەسـفی پـەستی ڕووی دونـیا
ئەمەیش دەس نادا مـەگـەر بـۆ ئـەبرار
بـــۆ مـــوخلیسانی کـــۆمـــەڵی ئـــەخیار
ئـیخلاسی نـییەت خـەیلێ زەحـمەتە
مـــەگـەر بـۆ دڵێ جـێگـەی ڕەحـمەتە
عـــارفەکـانیش کـــە زۆر مـــوخلیسن
لای خـۆیـان ئـەوان زۆرتـر مـوفلیسن
چوون هەتا ئینسان بە حـەق زانـا بـێ
ئـــەبێ بـــە ئـــەسرار زۆر ئـاشنا بـێ
بـــەگـــوێرەی دەرك و زانـایی خـۆیـان
پەی‌دەرپەی نوقسان دەرئەچێ بۆیـان
حـــەسەنەی ئـــەبرار وەك «سـیّآت»ە
لای دڵی عـــــارف بـــــەو دەرەجــاتە
کـــــەوابـــێ دایـــم دڵی ئـــەلەرزێ
لەلای تەنگ ئەبێ پانی سـەر عـەرزێ
ئـــیتر چـــۆن ئـــەبێ دڵی ئـــەمین بـێ
لە قـــاری خـــودا دڵی تـــەئمین بـــێ

سێهەمین: ئەڵێم بە ئیستیقامەت
خاتیمەی ئینسان ئەبێ سەلامەت
مەرتەبەی عالی بۆ موستەقیمە
بێ ئیستیقامەت ئینسان «سَقیم»ە
جا کەی ئەمین بێ لە گۆڕانی حاڵ
لە وەرگێڕانی کاتی ئیستیقباڵ
هەتا بنازێ بە کرداری خۆی
ئیستیغنا بکا بە ڕەفتاری خۆی
ئیتاعە و ئیخلاس بە ئیستیقامەت
مایەی ڕزگارین ڕۆژی قیامەت
مادام نەخۆشی بگا بە دڵمان
ئەڕوخێ پایەی ئیسلام و ئیمان
لەم ئەمانەتە بەشەر زەعیفە
ئەم ڕیعایەتە خەیلێ مەخیفە
بۆیە ساحێبی مەقامی مەحموود
فەرمووی لەتیفەی «**شَیَّبَتْني هُود**»[١]
«**یا مقلّب القلوب**»یش ڕاسە
هانا و هاواری «سیّد النّاس»ە

❊ ❊ ❊

١. واتە: سوورەتی هوود پیری کردم.

ئینسان ئەگەرچی خاوەن شمشێر بێ
مادام بە تەنیا هاودەمی شێر بێ
نابێ ئەمین بێ لەو چنگ و پەنجە
ئەگەر خاوەن بێ لەبۆ سەرنجە
نەفسی ئینسانیش شێرێکی سوورە
بۆ بەدکرداری گەلێ جەسوورە
یەکێ گیرۆدەی نەفسی بە «حِرص»ە
نابێ ئەمین بێ لەو مارە پیسە
واتەیێ ڕاست و ڕوون و مەعقوولە
خاتیمەی ئینسان لەلای مەجهوولە
بۆیە کۆمەڵی ئەبرار و ئەخیار
بە دەوام دڵیان پڕە لە ئازار

❊ ❊ ❊

ئەگەر تۆ ئەڵێت گەلی ئەنبیا
خاوەن مەرتەبەی بەرزی ڕووی دونیا
دراوە بەوان مـوژدە بە نەجات
زەحمەتیان نابێ ڕۆژی عەرەسات
دەی بۆچی هێشتا حەزرەتی ڕەسوول
ئەگریا بە جۆش، بە دڵی مەلوول!؟
ئەڵێم ئەنبیای خاوەن دەرەجات
مەعموورن هەموو بە «تجلّیات»

پڕتەوی خوا ئینسان دائەگرێ
شێوەی حاڵی خۆی لەلا لائەبرێ
فەرامۆش ئەکا ئەحواڵی شەخسی
ون ئەبێ لەناو تەجەللای قودسی
لەلای نامێنێ مۆژدەی ڕزگاری
بۆیە ئێتە سەر زاری و زگاری
بۆی دەرئەکەوێ نوقسانی بەشەر
لە هۆی سوپاسی «مُنعِم»ی ئەکبەر
جا تەبعەن چاوگەی دڵی ئێتە جۆش
ئەسرین ئەڕێژن چاویان بە خرۆش
تەقریبەن ئەمە موقتەزای زاتە
بە ئەو ئینسانە بە کەماڵاتە

❋ ❋ ❋

عەلاوە ئەڵێم نوختەیێکی ورد
پڕە لە مەعنا بۆ ئینسانی فەرد
دوو شتە مەبنای حوزنی ئینسانی
خەوفی نەفسانی و حوببی ڕۆحانی
لەبۆ ئەنبیا جۆشی سینە و دڵ
گەرمی مەحەببەت ئەیهێنێتە کوڵ
نابینی لە پاش زەمانی فیراق
کە ئەگەن بەیەك موشتاق بە موشتاق

دڵیـــان ئـــەبرژێ بـــەوێنـــەی کـــەباب
فرمێسك ئەڕێژن بێ حـەدد و حـیساب.
ئــەمە ویــجدانــە هــەرکەسێ نــەیبێ
یـا خـوا لە نـاوا دەفـتەری تـەی بـێ
هەرکەسێ نەیبێ گەرمی کوورەی مـەیل
زەنجیر نەکرابێ بە تای گـیسووی لەیـل
لە خـامی خـەیاڵ قـەت خـاڵی نـابێ
بـە **«الف لیـلة»** بـۆت حـاڵی نـابێ

❊ ❊ ❊

عـــەلاوەی ئـــەمە نـیشانەی عـیباد
هـــیچ نـــییە ئـیللا خـاڵی «انـقیاد»
ئـــینقیاد یـــانێ ئـــیتاعەی دەروون
فـــەرمانبەرداری بـــە دڵی مـــەحزوون
بـا خـوا بـە حـەق موژدە بـدا پـێت
دەرگـای مـەرحـەمەت بکـاتەوە لێت
دەس نادا بۆ مەرد بێ باکی و «طرب»
دەس نادا وەزعی غەفڵەت و لەعـەب
قەتعەن پێویستە تەحدیدی حـودوود
فەرمانبەرداری زیـللەت بـۆ مـەعبود
بـەندە بـەندەیە و بـەندی مـەولایە
گـــیرۆدەی حـوکمی حـەق‌تەعالایە

مەعبوود بێ باکە و بێ نیاز لە عام
حاکمی موتڵەق فەرمانڕەوای تام
کەوابێ بەندە لە ئیلتیجادا
راوەستێ لەناو خەوف و ڕەجادا!

❋ ❋ ❋

مونکیر بە وەهمی دەماغی زشتی
دینی تەشبیە کرد بە مادەی کەشتی
وتی چوون کەشتی مایەی ئەمانە
ئەمانی ئینسان پایەی ئیمانە
مادام موئمین بێ ئەبێ ئەمین بێ
نابێ لە قاری حەق نائەمین بێ
یانێ «مخافت» بۆ «مؤمن» لەغوە
هەرکەس بترسێ ترسەکەی سەهوە
لە خۆی نەگەیشت بە حەق «جاهل»ە
لە حەقیقەتی تەشبیە غافڵە
واقیعەن کەشتی وەسیلەی خێرە
مایەی ڕزگاری وەسیلە سەیرە
بەڵام کەشتیەوان ئەبێ «فنّان» بێ
بۆ کەشتیڕانی خاوەن نیشان بێ
لە سەیری کەشتی بە «احتیاط» بێ
لە کاری خۆیا بە «انضباط» بێ

لە سـووتەمەنی و هـەموو ئـەسبابی
بـێهـۆشـی نـەکـا بـە نـاحیسابی
خـەتی حـەرەکـەی دەریـا بـزانـێ
لابـــدا لە گـــێژ هـــەتا ئـــەتوانـێ
نـەکـا لە ناکـاو بشکـێ بـە مـەوجێ
بـبێ بـە مـایەی فـەوتانی فـەوجێ
هـــەروا دیـانەت وێنـەی کـەشتییە
بـــەڵام مـــوحتاجی ســـەرپەرشتیە
کـردەوەی ئـیخلاس بـە ئـیستیقامەت
شـــەرتی ڕزگـــاری ڕۆژی قـیامەت
ئـەم خـەوف و ڕجـا ئـێمـە هـەمانە
لەبـــــۆ پـــــارێزی خـــاتیمەمانە
خــوردا بـە فـەیزی مـیهرەبانی عـام
بـــپارێزێنـــی کـــەلیمەی خـــیتام
تـــەوفیقمان بـدە بـە ئـیستیقامەت
شـاد بـین بـە لیقات ڕۆژی قیامەت

❊ ❊ ❊

## «مُناجات»

ئـــەپاڕێمـــەوە بـــە ســـیدق و تـــەسەلیم
بـــــە ﴿بِسْـــــمِ اللهِ الرَّحْـــمٰنِ الرَّحِـــيمِ﴾
«یـــا حـــیّ أکـــرم، یـــا حـــیّ أکـــرم»
کـــەرەم فـــراوان، «فـیّاض»ی ئـــەرحـــەم
مـــیهرەبانی عـــام، بـــەخشەندەی کـــەرەم
بـــە فـــەیزی ڕەحـــمەت ڕاگـــیری عـالەم
دانـــای تـــەوانـــای خـــواهـــان بـــە سیفات
گـــــۆیـــــا و شـــــنەوا و بـــینای کـــائینات
پـــــەروەردگاری ســــــەراســــــەر جـــیهان
دانـــــــــا بـــــــە ڕاز و نـــیازی پـــــەنهان
بێ وێنە و مـانەند، بێ ڕشـتەی پـەیوەند
بـــێ‌نـــیاز بـــە کـــەس لە نـــیاز دەوڵەمـــەند
پـــــەنهان بـــــە پـــەردەی کـــیبریای زاتـــی
عـــەیان بـە جـیلوەی «شأن»ی و سیفاتی
فـــــەرمانڕەوای حـــــەق بـــەسەر جـــیهانا
بـــــــــەسەر عـــــــەیانا، بـــــەسەر نـــیهانا
لەســـــەر گـــیاندار و بـــێ گـــیانی عـــالەم
لەســـــەر فـــــریشتە و پـــەری و بـنیادەم

لە چەرخی گەردوون، لە باڵای عەرشا
لە فەزای جیهان، لە کاڵای فەرشا
فەرازەندەی چەرخ گەردوون سەما
نەوازەندەی باب بە عیلم ئەسما
تۆی خاوەن گەنجی خەزێنەی ڕەحمەت
تۆی خاوەن کونجی دەفینەی نیعمەت
تەوانای موتڵەق، تۆی خاوەن فەرمان
بە تۆیە دەرد و لە تۆوە دەرمان
تۆ عەرزی نیاز ئەکەی بە ڕۆزی
تۆ سەبەبسازی، تۆ سەبەبسۆزی
هەرتۆی قاپی خێر واز ئەکەیتەوە
هۆی ڕاز و نیاز ساز ئەکەیتەوە
بە تۆیە مایەی بەختیاریمان
بە تۆیە ئایەی «عَون» و یاریمان
تۆ ئەکەیتەوە گرێ لە موشکڵ
هەرلای تۆ ئەشێ لاڵە و زاری دڵ
تۆ بۆ داماوان کەرەم بە جۆشی
تۆ بۆ تاوانبار تاوان ئەپۆشی
تۆی هۆی ڕزگاری لە تۆفانی دەرد
تۆ ڕزگار ئەکەی مەردان لە نامەرد
تۆی جێی ئومێدی ئومێدەواران
تۆی مایەی شیفای دڵ دەردەداران

تـۆی لە تـۆی شـەوان ڕۆژ ئـەکـەیتەوە
دونـــیا بـە پـڕتـەو ڕوون ئـەکـەیتەوە
هـەر تـۆی وەرئـەگـری ڕازی مـوناجات
تۆی بۆ مـوحتاجان «**قـاضی الحـاجات**»
هـــەناو ســـووتاوم، هـــانام هـێنـاوە
بـە جـێی هـانای عـام پـەنام هـێناوە

❊ ❊ ❊

قـــەسەمت ئـــەدەم بـــە کـیبریای زات
بە جـیلوەی جـەلای «نـعوت» و «صفات»
بـە کـونهی زاتت بـە مـەعنای سـیفات
بـە تـەجەللای خـۆت لەسـەر کـائینات
بـــە هـــەزار و یـــەك نـــاوی نـاودارت
بـە ئـەسمای حـوسنای بـە ئـیعتیبارت
بـــە سـیرڕی سـەفای ﴿وَ لَـقَدْ کَـرَّمَ﴾
بـــە نـــووری بـــەهای ﴿عَـــلَّمَ آدَمَ﴾
بـە جـیلوەی نـووری ئیسمی ئـەعزەمت
بـە سـینای «طـور»ی زاتـی ئـەکرەمت
بـە سـەدهەزار و بـیست و چـوار هـەزار
ڕەهـــــنومایانی ڕێگـــــەی ئـــیعتیبار
بـە سـێسـەد لەگـەڵ سیازدە پـێغـەمبەر
ڕەوانـــە کـــراو بـــۆ تـــەمێی بـــەشەر

بە پێنج «اولوالعزم»، عومدەی ڕەهبەران
بە فەخری عالەم، مەولای سەروەران
بە مەلائیکەی «حَمَلَة العَرش»
بە نیگابانی عالەمی ڕووی فەرش
بە «مقرّبان» لە بارەگادا
بە ئەمین لەسەر وەحی خودادا
بە باقی سینفی فریشتەی گەردوون
گەردنکەچەکان بۆ ئەمری بێ چوون
بە پایەی ئادەم لەسەر فریشتە
بە مایەی بەرزی لە گڵ سروشتە
بە ڕزگاریی نووح لە تۆفی تۆفان
بە بوردەباری ئەرپابی عیرفان
بە ڕەهنومایی قەلبی ئیبراهیم
بۆ تەوحیدی خۆت بە سیدق و تەسلیم
بە ڕزگاری ئەو لە ناری نەمروود
بە گەیشتنی بە مایەی مەقسوود
بە خۆگرتنی قەلبی ئیسماعیل
لەبۆ سەربڕین بە دەستی خەلیل
بە حوزنی یەعقووب لە دووری دڵبەند
بە سەبری جەمیل لە هیجری فەرزەند
بە سەبری ئەیووب لەبەر بەڵادا
بە تاکی یۆسف لە بنی چادا!

بـــە تـــەسبیحاتی یـۆنسـی «ذُوالنُّـون»
لە سکــی مـاسی نـاو دەریـای نـوگوون
بـــە ســـەڵتـــەنەتی نـــەبی ســولەیمان
لەسەر وەحشی و تەیر، لەسەر ئینس و جان
بـــــە مـــوناجاتی حـــەزرەتی مـــوسا
بـــــە دەرەجـــاتی حـــەزرەتی عـــیسا
بـــــە نـــــەغمەی داوود لە بـــەربەیانا
بـــە تـــەسبیحاتی لەگـــەڵ کـــێوانـــا
بـــە تـەجەللای خـۆت لەسـەر موحەممەد
خـــاوەن مـــەقامی ڕیســـالەی ئـــەبەد
بـــە خـــولقی بـــەرزی لە ڕووی عـالەما
بـــــە فـــەیزی بـــەسەر بـــەنی ئادەما
بـــە تکـــا و ڕجـــای ڕۆژی ڕەســـتاخێز
بـــۆ تـــاوانـــباری گـیرۆدەی بـێ هـێز
بـە سـەبری سـەفای لە جـەفای نـامەرد
بـــە حـیلمی لەگـەڵ دوژمـنی دڵ بـەرد
بـە هـۆی پـیرۆزی کـەلیمەی تـەوحید
بـــە هـــۆی دڵســۆزی قـورئانی مـەجید
بـە مـاددە و مـەعنا مـوعجیزەی قـورئان
بـــــە پـــایەداری تـــا ئـــاخرزەمان
بـــــە ڕاگــــرتنی قـــورئانی ئـــەنوەر
بـــە وەرگــــرتنی حـــەدیسی ســـەروەر

بــــە ســـــیرِی قـــورئان لەبــەر کــردنی
لە پــــــەردەی دڵا ئــــــەسەر کـــردنی
بــە سـازی ئـاوای قـورئان خـوێنـەکـان
بــە سـەفای سینەی حـەق نـوێنـەکـان
بــــە ئــالی بـــەیتی کــائینات ئـــارا
بـــە نــــەسڵی ئـەسڵی فـاتیمەی زەهــرا
بـــە یـارانـی «بَـدر»، شـێرانـی ڕەشـید
بـە تـیپی «اُحُــد»، بــە حـەمزەی شـەهید
بــە دەســتی دەسـتەی «بَــیعَةُ الرِّضــوان»
بــــە ڕەزامـــەندیت لەســــەر هــەموویان
بـــە مـــوحەددیسان، بـــە پـەیڕەوانــی
بــــــە تـــــابیعینی پـــڕ لە ئـــیمانی
بـــە مـــوجتەهیدان لە عـــیلمی دیـــنا
بــــــە مـــــــوجاهیدان لە ڕێی یـــەقینا
بـــە غـــازیانی ســـەر کـــەشتی دەریـا
بــەو خـوێنـە شـەهید ئـەرژێ لەبـەریا
بـــە نـــووسەرانــی ئـەبحاسی عـیلمی
بــە ئـــوستادانـــی تــەربیەی ئـومی
بـــە هـۆی تـەعلیمی ئـوستادانـی پـاك
بــە سـیدق و سـەفای فـەقێی دڵڕوونـاك
بـە هـۆی غـەریبی عـیلم خـوێنـەکـان
لە دڵی نــــەزان خـــەمڕەوێنـــەکـــان

بـــە نـــووری ســـینەی ئـــەولیاکـــانت
وێنـــــەی دەفـــینەی ئـــەسفیاکـــانت
بـــە «فـــیوضات»ی نـــووری تـــەجەللی
بـــــە مـــەقاماتی قـــوڕب و تـــەدەللی
بـــە ئـــیرشـاداتـی مـورشـیدانـی پـاك
بـــــە ڕیـــازاتـــی مـــوریدی چـــالاك
بـــە شـــەوبێداران لە خـــەڵوەتگـای نـاز
بـــە دڵ هـــۆشـیاران بـۆ عـــەرزی نـیاز
بـــــە بـــێدارانـــی کـــاتی بـــەربەیان
بـــە سـۆزی سینەی جـەرگ و دڵ بـوریان
بـــە کـــەمەربەندی خـــادمانی پـــاك
بـــە خـــێرۆمـەندی مـەردانـی چـالاك
بـــە وەعـــی قـەلبی خـاوەن عـینایەت
بـــە سـەعی و کـۆشش بـۆ ڕێی هـیدایـەت
بـــــە ڕێڕەوانـــــی ڕێی ئـــیستیقامەت
بـــێ بـــاك لە زەحـــمەت هـــەتا قـیامەت
بـــە جـــیلوەی وەفـــا لە نـــاو دڵانـــا
بـــە شـــێوەی ســـەفا لەســـەر گـــوڵانـــا

❊ ❊ ❊

بـــە سـوجدەبەران بـە ڕووی پـێشـانی
بـــە ڕۆژووگـیران بـێ دووی نـەفسانی

بـە هـەڵسـووڕانـی دەوری «بـیت الله»
بـــە ئـیخلاسی دڵ بـە ڕۆحـی ئـاگـاه
بـــە واجب دەران لە ڕێی خـــودادا
بـــێبـاری مـنەت بـەسەر گـەدادا
بە ئیحسان لەگـەڵ موستەحەقەکـان
بە حەقپەرەستی خاوەن حـەقەکـان
بـە فـەریادڕەسـی دڵسـۆزانـی پـاك
بـۆ غـەمی دامـاو بەڕاسـی غـەمناك
بـە عـەدڵ و دادی خـاوەن دادەکـان
بـــەفەرمانداری پـــاكنیهادەکـــان
بـــە پـــەناداری خـاوەن پـەناکـان
بـە تـاوان بـەخشی سینە میناکـان
بـە پـاکـی نـییەت بـە ئـیخلاسی دڵ
بە جەهد و کۆشش بۆ حەللی موشکڵ
بـە نـوور و بـەهای خـاوەن شـعووران
بە شەرم و حەیای چیهرە مـەستووران
بـــە تکـای مـەردی بـە ئـایەومایە
لای فـــەرمانڕەوای بـە هـێز و پـایە
بـە موسلیحانی وەیشـوومەی عـالەم
بـــە ڕەهـــبەرانـی نـەتەوەی ئـادەم

❋ ❋ ❋

بە عەشقی پاکی قەیسی پۆس بە کۆڵ
بە ئاهی داماو لە ڕێبازی چۆڵ
بە ناڵەی عاشق پڕ بە پەڕەی دڵ
بە جۆشی بولبوڵ لەسەر چیهرەی گوڵ
بە تاوی تۆبەی تاوانبارەکان
بە پەشیمانی شەرمەسارەکان
بە پاڕانەوەی داماوی ماتڵ
بە موناجات و لاڵە و پاڵەی دڵ
بە سزا و ناڵەی گیرۆدەی دەردان
بە تکا و ڕجای هەناسەسەردان
بە سۆزی سینەی هیجرانان دیدە
لە دووری ڕۆڵەی تازە ڕەسیدە
بە ئاه و ناڵەی دەروون بوریانان
بە داد و لاڵەی دیدەگریانان
بە سەرگەردانی غەریبی شاران
بە بێدەرمانی خەستە و بیماران
بە لارەملی هەتیوی داماو
بە چەلوملی شەخسی لێ قەوماو
بە کزەی سینەی دایەی میهرەبان
بە میهرەبانی بابەی دڵ بوریان
بە کزەی دایە بۆ ڕۆڵەی مردوو
بە کزی دیلی نامەردان بردوو

بە کزی دڵی باوکی بەهرەمەند
بمرێ بێ جێدار، بێ ڕۆڵەی دڵبەند
بە کزەی دڵی مەردی خانەدان
کە بەبێ وەجاخ دەرچێ لە مەیدان
بە کزەی دڵی کچی بێ تاوان
بە غەم گەڕاوە لە ماڵی باوان
بە داخی دڵی خاوەن ئومێدان
کە نائومێد بوون لە جێی ئومێدیان
بە داخی دڵی سەمەر فەوتاوان
بە ئاخ و ناڵەی جگەر سووتاوان
بە داخی دڵی ئامۆژگارەکان
کە سوودی نەبێ بۆ بەدکارەکان
بە داخی دڵی کتێب نووسەران
فەوتا کتێبیان لە دەشت و دەران
بە داخی دڵی ڕەنجان بابردوو
سوودی لە ڕەنج و مەینەت نەبردوو
بە ئێشی مەرگی مەخدوومانی بەرز
لە ڕیشەی جەرگی مەردانی بە عەرز
بە ئێشی تانەی تاڵی بەدئەندێش
بە یانەی خاڵی لە خزم و لە خوێش
بە ئێشی خانەی خاوەنان مردوو
بە ئێشی ڕۆڵەی بێناز داکەوتوو

بە ئێش و نالەی بیماران بە دڵ
گیرۆدەی گرێی کارانی موشکڵ
بە ئێش و نالەی خەستەی دڵ پردوو
لە نێشی دەردی زوو جێگە گرتوو
بە ئێش و نالەی گرفتاری ژان
لە سك و مەمە و سەروچاو دژان
بە دیلی نامەرد بە هەناسەی سەرد
بەو هاوارانە کە ناگەن بە مەرد
بە گیرۆدەی چای بەندیخانەی جەور
لە کارەساتی گەردوونی کەچ دەور
بە ئێشی تەمای دیداری یاران
بە چاوەڕوانی دڵ ئینتیزاران
بەو هەنسکانە کە داماو ئەیدا
فرمێسکی گەرمیش ئەڕژێ لەگەڵیا
بە ئاهی بابە و دایەی دوواگیان
کاتێ ئەڕوانن بۆلای ڕۆڵەیان
ئەمجار بەو ڕەحمە لەبۆ خۆت دانا
بەو ڕەحمە بەخشیت بە ڕووی جیهانا
بە نەشئەی شەوبای شەماڵی ڕەحمەت
کە بەرباد ئەکا خەرمانی زەحمەت
بە نەوای شیفای لەتیف پەنهانیت
بە سەفای شۆڵەی ڕووی میهرەبانیت

بـــە شـــیفای بـــیمار لە دەرد و ئـــازار
بـە حـــەللی مـــوشکڵ لە ڕووی ڕۆزگـــار
بـــــە شــــــادمانی گـــــەلی دڵداران
بـــە شـــادی لیـــقای دیـــداری یـــاران
بـــە پـــاراســـتنی دۆســـتت لە دوژمـــن
بـــە فـــەنای دۆژمـــن بـــۆ بـــەقای «مـؤمن»
بـــەو ڕەحـــمە ئـــەیکەی بـــە نـــاتەوانـــان
ئەیان کەی بە شای ڕووی چەرخی زەمان
بـــە تـــۆڵە ســـێنـیت لە ســـتەمکاران
ئـــەبن بـــە عـــیبرەت لەبـــۆ هـــەزاران
بـــەو هـــێزە هـــەتە لەفـــەزای گـــەردوون
مـــوعجیزە ئـــەکـــەی بـە «**كُـنْ فَـيَكُون**»
وا حــــەقی حــــەقدار بـــاش ئـــەدەیتەوە
غـــەمی چـــەن ســـاڵەی بـــیر ئـــەبەیتەوە
بەو ڕەحمە ئـەیکەی بـە خـاوەن «عِـفّت»
کـە دایـئەپۆشـی بـە پـەردەی «عِـصمَت»
بـــەو ڕەحـمە ئـەیکەی لەگـەڵ جـەوانـان
ئـــەگـــەرێنـــەوە لە ڕێگـــەی تـــاوان
بـــە جـۆشی ڕەحـمت بـە وێـنەی بـاران
بـــۆ عـــەفووی گـــوناه لە تـــاوانـــباران
بە ڕشتەی سونعی حیکمەتکاری خۆت
بـــە یـــاسای نـــەزمی جـیهانداری خـۆت

بــە تــاوی پــەڕتــەو کــائینات ئــارا
پــەڕتــەو ئــەبەخشێ بــەسەر کــۆســارا
ڕوون ئــەکــاتەوە کــێو و دەر و دەشت
جیهان خۆش ئەکا بەوێنەی بەهەشت
بــە لرفــەی نــووری مــانگ لە مــانگەشەو
بــە بــرکەی شــەوقی ئــەستێران بە دەو
بــە نــاڵەی ڕەعــد و بــە بــەرقی ڕوونــاك
بــە هــاڵەی قــەمەر لە فــەزای ئــەفلاك
بــە هــەوری ڕەحــمەت، بــە تـاوی بـاران
بــە تــافەی ئــاوان لەنــاو ڕووبــاران
بــە خــۆشــی خــوڕڕەم لە بــەهارانــا
بــە تــاو ئــێتــە خــوار بــە کــۆســارانــا
بــە قــەدری بــاران بــۆ خــاوەن کشــتان
بــۆ فــەلای ســارا، بــۆ بــێڵ بــە مشــتان
بــە ســافی شــەونم لە ڕووی گــوڵاڵان
چوون نم لەسەر ڕووی نــازك نــەوساڵان
بــەو نــەزاکــەتە لەنــاو دڵایــە
بــەو لەتــافەتە لەســەر گــوڵایــە
بــە عــەتر و عــەنبەر، بــە ڕەوح و ڕەیحان
بــە نــەشەی واتــەی زمــان فــەسیحان
بــە نــەشئونمای گــیا و گــیانداران
بــە شــنەی گــەڵای ســەر شــاخی داران

کـە هـەموو ئـەشنێن بـە هـێزی زاتت
هــــەموو بـــورهانن لەســــەر ســیفاتت
بــــە ئــــەهلی ڕەزا، بــە قــەزای جــەببار
بـــە ســــابیرانـــــی مـــــەینەت و ئــازار
بــــە خـێرۆمـــەندی خـــاوەن دەوڵەتـــان
بـــە ســـوپاسکاری خـــاوەن نـــیعمەتان
بــــە فــــەرمانبەری ڕۆڵەی بـــــە مــــایە
کــــاتی زەعـــــیفی بـــــۆ بـــــابە و دایــە
بــە سیلەی ڕەحـمی مـەردی بـەغیرەت
بۆ خوێشی دڵڕێش، لە چـینی عـەشرەت
بــە مــەردی مــەردان، بــۆ دراوســـێیان
بـــــە دڵنـــــەوایـــــی لەبـــــۆ هــــاوڕێیــان
بــــــــە خـــــــــاترداری عـــــالمی زانــــــا
لەنـــــاو نـــــەزانــــــان بـــــێ مــایە و پــەنا
بـــــە خـــــاترداری پـــــیاوی بـــــە مــــایە
کــــاتێ لێی قــــەوما لەم ڕووی دونـــیایە
بـــــە خـــــاترداری مـــــیوانـــــی غـــەریب
وەکـــــوو مـــیوانـــی دڵبـــەندی حـــەبیب
بـــــەهۆی ئـــینسافی خـــاوەن ئـــینسافان
بــە پــاکــی نــیهاد لای دەروون ســافان
ڕەبـــــبی مــــــن بـــــە کــولْ ئــەپاڕێمــــەوە
بـــــــە زمـــــــانی دڵ ئــــــەلاڵێمــــــەوە

بـــە مـــیهرەبانیت لەگـــەڵ ڕەهـــبەران
بـــــە نـــیگابانیت بـــۆ گـــیانلەبەران
بـــەو لوتـــفە کـــردت بـــە دەوڵەمـــەندی
لەگـــەڵ مـــوحەممەد، بۆ ئـەرجومەندی
کـــردت بـــە ڕەهـــبەر بـــۆ هـەموو عـالەم
کـــــردت بـــــە سـەروەر بـۆ بـەنی ئادەم
ئـــــەیخەیتە تکـــا بـــۆ تـــاوانـــباران
تـــا عـــەفووت ئـــەڕژێ بـــەوێنـەی باران
ئـــەمجا جـــاڕ ئـــەدرێ لە مـــەحشەرگادا
بـــــە نـــاو ئـــەنبیاو بـــە ئـــەولیادا
هـــەرکەس ئـەیەوێ بێت بـۆ شـەفاعەت
خـــودا تـــاڵبـــە بـــۆ عـــەفووی ئـوممەت

❋ ❋ ❋

بـــەو بـــارە داتـــنا لە کـــانی خـــاکـــا
بـــەو خـــێرە داتـنـــا لە شـــیری پـــاکـــا
بـــەو نـــووره داتـــنا لەنـــاو جـــەمالا
بـــەو فـــەیزە داتـنـــا لەگـــەڵ کـــەمالا
بـــــەو ئـــــاسایشە وا لە بـــــەهەشتا
کـــە وێنـــەی نـیـیە لە عـــالەم گشـتا
بـــەو جـــەزبە داتـــنا لە دەنگی خـۆشـا
بـــەو دەرکـــە داتـنـــا لە فکـــر و هـۆشـا

بـــەو تـــامە داتـــنا لە مـــێوەجـــاتا
بـــە بـــەرزی و نـــزمی لە دەرەجـــاتا
بـە سـیڕڕی «خـلود» لەبـۆ «**خـالِدین**»
بە عەیش و نۆشی جەرگەی ئەهلی دین
بەهۆی ئەو دەستە بەرز ئەکرێتەوە
خـــاوەنی لە خـــودا ئـــەپاڕێتـــەوە
دیســان بــەو پایە کە دات بە خاتەم
کـــردت بــە شــەفیع بــۆ بــەنی‌ئادەم
خـۆت قـاپی ئـیحسان بکـەوە لێمـان
لوتف و ڕەحمی خۆت نیشان دە پێمان
تەسلیممان مەکە بە نەفسی خۆمان
خـــۆت بســازێنــە مــەرام لەبــۆمــان
بـــمانپارێزە بـــە ســـەفای مـــەردان
لە تـــیری تـــانە و جــەفای نــامەردان
ڕاگـــیرمان بکـــە لەســەر حــەقیقەت
پـــایەدارمـــانکە لەســەر شــەریعەت
بـەهۆی کـردەوەی نـاباری خـۆمـان
مـــەبەستە قـــاپی ئـیحسانت لێمـان
بـە لەشــی ساغ و قـەلبی بـە تـەمکین
بـەکـارمان بـێنــە بـۆ خـزمەتی دیـن
ڕیســـوامـان مـەکـە لە دونـیا و دیـنا
لەنـــاو کـــۆمـــەڵەی ئـەهلی یـەقینا

بــە تکــا و ڕجــای ڕەهــبەری نــازار
لە عــــەرەساتا بــۆ ئــەهلی ئــازار
نەشئەی فەیزی خۆت کەرەم کە پێمـان
نــەسڵمــان نــەڕۆن بــێ‌دیـن و ئیمان
تــەوفیقمان بــدە لەســەر ڕێی ئیسلام
ئــاخرمان بـێنــە بــە «خــیر الخــتام»

❊ ❊ ❊

ژمــــارەی بــەیتن ئــەم ڕەقــەمانە
نــــیشانەی حــوسنی خــاتیمەمانە[1]
لە نــــاوەڕاســتی «ربــیع الثّــانی»
لەنــاو مــەدرەسەی غــەوسی گــەیلانی
لە ســاڵی هــیجری ڕەهــبەری نــازار
هەزار و سێســەد، هــەم هــەشتا و چــوار[2]
تــازەم کــردەوە نــامەی بــەختیار
لەبــۆ ئــیرشــادی نــەتەوەی هــۆشــیار
خــاتیمەم هــێنــا بــەم مــوناجاتە
«انشــاءالله» مــایەی ڕەوای حــاجاتە
واتــەی ئــاخرم «صَــلاة» و «سَــلام»
بــۆ ڕۆحــی هــەموو ئــەنبیای کــیرام
مەخسووس موحەممەد «ختم المرسلین»
ئــەمجار بــۆ ئال و «صَحب» و تــابیعین

---

١. ١٨٨١.   ٢. ١٣٨٤.

مــەختووم بــە حــەمد و ســەنا بـۆ خـودا

**«الْـــحَمْدُ لِـــلّٰه، الْـــحَمْدُ لِـــلّٰه»**

تەواو بوو «وَ لِلّٰهِ الْحَمْدُ» ئەم نامەی بـەختیارە لەگـەڵ ئـەم مـوناجاتا لە دەرگای خودای «ارحم‌الرّاحمین».

و أنا المُفتقِر إلى اللّٰهِ، عبدالکریم محمّدالمدرس الکرديّ الشّهرَزوريّ مدرّس مدرسة «عاتکه خاتون» بالحضرة الگـیلانیّة قـدّس سـرّه العـزیز، آمین.

❊ ❊ ❊

پاش ئەمە ئەڵێم هۆی ئەم تەئلیفە
بۆ ئەو یارانە خوویان شەریفە
دڵم نەخۆش بوو بە گەلێ ئیشکال
بۆ دڵم بووبوون بە مایەی مەلال
ڕۆژ لە ڕۆژ بەدتر چاوم تاریک بوو
ڕێگەی هاتووچووی دڵم باریک بوو
جا کەوتە گەردش بە دوای دەرمانا
لە سەر زەمین و لە ئاسمانا
بەڵکوو پزیشکێ دانای دەس کەوێ
لە دەرمان کردن پەکی نەکەوێ
بیکا بە یار و بە ئاشنای گیان
هۆی ڕزگاریم بێ بۆ ماوەی ژیان
"نامەی بەختیار" بداتە دەستم
تا بەختەوەر بم لە سەر مەبەستم






امام ربانی
انتشارات امام ربانی
Emam Rabani
Publication